1- Grupp processer. Sven Stensaasen & Olav Sletta
2- Fem år av ditt liv. Barnens utveckling under åldersperioden 7-12 år. Barbro Goldinger & Gunilla Magnusson
3- Spelar läraren någon roll? Stellan Sjödén..
4- Ditt Lilla Barn och Du. Anneta Tholstrup.
5- Föräldrars kunskap - De lycklige åren. Ottar Ottersen.
6- Möt mig. Solveig Grönström Beskow.
7- Barn och Föräldrar i Samspel. Marie Eenfeldet.
8- Att förstå barns tanker. Elisabet Doberborg & Ingrid Pramling.
9- Sköt om ditt barn. Benjamin Spock.
10-Sago Skolan. Rigmor Lindö.
11-0-17 Fakta om barn och ungdomar i Sverige.
12-Att samtala med barn. Joan Tongh.
13-Ungar är olika. Agneta Hellström.
14-Våra Barn. David Fontana.

1- Grupp processer. Sven Stensaasen & Olav Sletta
2- Fem år av ditt liv. Barnens utveckling under åldersperioden 7-12 år. Barbro Goldinger & Gunilla Magnusson
3- Spelar läraren någon roll? Stellan Sjödén..
4- Ditt Lilla Barn och Du. Anneta Tholstrup.
5- Föräldrars kunskap - De lycklige åren. Ottar Ottersen.
6- Möt mig. Solveig Grönström Beskow.
7- Barn och Föräldrar i Samspel. Marie Eenfeldet.
8- Att förstå barns tanker. Elisabet Doberborg & Ingrid Pramling.
9- Sköt om ditt barn. Benjamin Spock.
10-Sago Skolan. Rigmor Lindö.
11-0-17 Fakta om barn och ungdomar i Sverige.
12-Att samtala med barn. Joan Tongh.
13-Ungar är olika. Agneta Hellström.
14-Våra Barn. David Fontana.

لێکۆڵینەوەیەکی زانستیانەی هەست و بیر و ڕەفتاری منداڵە لە تەمەنی (7 - 12) ساڵیدا

لەگەڵ ڕۆڵی گرنگی مامۆستا لەم تەمەنەدا

ئامادەکردن و کۆکردنەوەی: شێرزاد فەقێ عەلی

Sherzad mustafa

Lindhemsvagen 48

19451 upplandsvasby

Stockholm-sweden

E- mail: sherzad_mustafa@hotmail.com

Phon:0046709532253

سەرپەرشتی زانستی : د. عەبدولباقی ئەحمەد

دکتۆری تایبەتمەندی دەروونیی منداڵ

Dr Abdulbaghi Ahmad ،MBChB ،PhD

IACAPAP Ambassador

Assisting Professor & Founder of

Child Mental Health & Metin Health House

Duhok ،Kurdistan Region - Iraq

Associate Professor & Senior Consultant in

Child and Adolescent Psychiatry

Uppsala University - Sweden

Office Phone: 0046186112555 ،fax: 0046186112565

E-mail: abdulbaghi.ahmad@neuro.uu.se

خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

(بەرەو پەروەردەی منداڵ: ژمارە (2

منداڵ لە تەمەنی چوونە قوتابخانەدا ●

ئامادەکردن و کۆکردنەوەی: شێرزاد فەقێ عەلی ●

سەرپەرشتی زانستی : د. عەبدولباقی ئەحمەد ●

نەخشەسازی ناوەوە: باران●

بەرگ: ڕێمان ●

چاپی یەکەم: سوید 1997 - چاپی دووەم هەولێر 2013 ●

تیراژ: 1000 دانە ●

نرخ: 2000 دینار ●

(چاپ: چاپخانەی مورکریانی (هەولێر●

- له بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (2552)ی ساڵی 2012 پێدراوە.

(زنجیرەی کتێب (715



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

ناوەڕۆک

هەرچەند پیاو کەم بزانێت، وا دەزانێت کە زۆرتر دەزانێت

کاتێ باسی ناتەواوی خەڵکی دەکەم، بەهیوای ئەوەیە، کە سەرنجی خەڵکی ڕابکێشم بەلایەکی ترداو ناتەواوییەکانی خۆمیان پێ داپۆشم.

:پێشەکی

به چوونه قوتابخانه، قۆناغێکی تازه له ژیانی منداڵ دەست پێدەکات، که لەهەموو ڕوویەکەوه جیاوازه له قوناغی پێشووی. لەم قۆناغەدا منداڵ بناغەی هەموو پێشکەوتنێک دادەڕێژێ و پێ دەخاته نێو ژیانی کۆمەڵایەتیەوه. زانیاری لەبارەی ئەم قۆناغەی منداڵ بریتیه له زانیاری قوتابخانه و پەیوەندی منداڵ به مامۆستاو لەیەکگەیشتن و پیشەی مامۆستایەتی و جۆری فێربوونی بۆ زانستی جۆراوجۆر. ڕۆڵی مامۆستا ناتوانرێ له ژیانی منداڵی ئەم قۆناغەدا فەرامۆش بکرێت. منداڵ هەوڵدەدات دەست له خێزان بەربدات و خۆی بخاته باوەشی قوتابخانەوه. بۆئەوەی قوتابی ئەم قۆناغه بەسەرکەوتوویی ببڕێ پێویستی به یارمەتی هەیه، بەتایبەتی لەم کاتەدا که منداڵ له نێوانی ماڵ و قوتابخانەدا جۆلانه دەکات، خێزان زۆرجار دەستی ناگاتێ بۆئەوەی قسەی لەگەڵ بکات و ئەویش زۆر نایەوێت باسی قوتابخانه بکات و قوتابخانەش لەوانەیه نەتوانێت به هەموو کاری زانستی و کۆمەڵایەتی و پەروەردەکاری خۆی به باشی هەڵسێت وانەبێت .که منداڵەکه تێیدا بحەسێتەوه

دیاره ئامادەکردنی پەرتووکێکی پەروەردەیی، که بگونجێ لەگەڵ ڕەوشی کوردەواریدا و سوودی پێ بگەیەنێ، پێویستی به لێکۆڵینەوەی کۆمەڵی کوردەواری خۆی هەیه، که ئەمەش پێویستی به شارەزایانی ئەو بواره هەیه و کارێکی درێژخایەنی دەوێت، که ئێمەی کورد له هەردووکیان بێبەشین و .چاوەڕوانکردنیش بۆ هاتنەدی هەلومەرجێکی وا زۆر درێژخایەن دێته بەرچاو

لەبەرئەوەش که باسەکه بەو شێوەیه نییه، بتوانرێت پەرتووکێک له بەرگەوه بۆ بەرگ بگۆڕدرێته سەر زمانی کوردی و لەهەمانکاتدا دایک و باوکی منداڵانی کورد به ئاسانی تێی بگەن، چونکه ئەوەی له کۆمەڵێکدا ڕوون و ئاشکرایه و شتێکی سادەیه لەوانەیه له کۆمەڵێکی تردا ببێت بەهۆی به هەڵه تێگەیشتن و

تەنیا باسکردنیشی ببێت بەهۆی نارەزایی هەندێ لە خوێنەران، یاخود هەندێ لەو باسانە تایبەتی بێت بە کۆمەڵێکەوە لە کاتێکی تایبەتیدا، کە هیچ پەیوەندی بە کۆمەڵی ئێمەوە نەبێت و نەشتوانرێت سوودی لێوەربگیرێ یاخود......جا بۆیە کارێکی وا هەرچۆنێک بێت کەموکوڕی تێدا دەبێت و ناتوانرێت هەموو لایەنەکانی باسەکە بە خوێنەرانی خۆی بناسێنێت، لەبەرئەمەشە کە ئامانجی من هەر ئەوەندەیە باسەکە بورووژێنم بە گۆڕینی ئەم زانستنە بۆ زمانی کوردی تا بەهۆی ئەمەوە ئێمەش بتوانین سوود لەو زانستانە وەربگرین و لەوێوە بناغەی ئاڵوگۆڕی بیروڕای خۆمان بکەین، لە دوارۆژیشدا بتوانین ئەو تایبەتمەندییانەی هەست و نەست و دەروونی منداڵی کورد دەستنیشان بکەین و هەوڵبدەین .منداڵێکی سەربەست و ئازاد پەروەردە بکەین

بۆ ئامادەکردنی ئەم پەرتووکە بە پلەی یەکەم سوودم لە سێ پەرتووک وەرگرتووە، کە باسەکانی گونجاون لەگەڵ ئامانجی پەرتووکەکەی مندا و بە .دەستکارییەوە گۆڕیومنەتە سەر زمانی کوردی

بۆ ئەوەی بچینە سەر ناوەڕۆکی باسەکەمانەوە، باشتر وایە جارێ ساڵێک بگەڕێینەوە دواوە و بزانین ئەو منداڵەی کە ئێمە باسی لێوە دەکەین کێیە و لە چ پلەیەکی پێشکەوتنی ژیاندایە؟ چۆن بیر لە ژیان دەکاتەوە؟ منداڵێکی شەش ساڵان جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ منداڵێکی پێنج ساڵان، لەبارەی شێوەی دەموچاو و لەشولار، هەڵسوکەوت، هەستی دەروون و مێشکیەوە..هتد.. هەیە. ئێستا خەریکە گەورە دەبێت و ئەوەندە لەسەرخۆ و گوێڕایەڵ نییە و تا ڕاددەیەک ئاژاوەچی و شەڕانییە. جاری وا هەیە تەمەنی شەش ساڵی بە تەمەنی (باڵقووبنی یەکەم) ناو دەبرێت، گەورەبوونێکی خێرا لە ئەندامانی لەشیدا ڕوودەدات و زیاتر ئەندامەکانی لەشی لەگەڵ یەکتردا دەگونجێن و دەموچاو و دەست و قاچی گەورەتر دەبێت، ئەمە وا دەکات کە ئەم منداڵە جارێ ڕانەیێت لەسەر ئەم گۆڕانە گەورانە بەسەر لەشیدا دێن و وای لێدەکات کە نەتوانێ دەست بەسەر جووڵاندنی دەست و قاچیدا بگرێت، شت دەڕێژێ لە کاتی ڕۆیشتندا قاچی تێکەڵ و پێکەڵ دەبێت و خۆی ئازار دەدات و دەکەوێت، شت لە دەستی دەکەوێتە خوارەوە و شت دەشکێنێ، چونکە ناتوانێ بە تەواوەتی کۆنترۆڵی لەشی خۆی بکات. نیشانەیەکی تری ئەم قۆناغە ئەو کەلێنەیە کە لەناو دەمیدا بەهۆی کەوتنی

ددانەکانی سەرەوەی دروست بووە و دوایش هاتنەوەی دوو دانی گەورە، کە ئەمە گرنگە نەک تەنها بۆ منداڵەکە بگرە بۆ هەموو خێزانەکەش و سەرگوزشتە و باسێکی زۆر لەو بارەیەوە دەگێردرێتەوە و منداڵ بەزۆر شێوە هەوڵدەدات کە ئەو ڕووداوانە پەلە پێ بخات و زوو ڕووبدەن و بۆ ئەمەش زۆر پلان دادەنێ بۆدەرهێنانی ددانی و دەیەوێت بزانێ دوایی چی ڕوودەدات.

ئەم منداڵە پێویستیەکی یەکجار زۆری بە جووڵان هەیە، بۆئەوەی ئەو وزەیەی تێیدایە بە کاری بهێنێ، بەتایبەتی لەلای کوڕان پێویستیان زیاتر بە جووڵان هەیە لەبەرئەوەی ئەو وزەیەی تیایاندایە زۆرترە لە کچان، ئەمانە بەسەر هەموو شتێکدا، کە دێتە ڕێیان سەر دەکەون، سەرکەوتن بەسەر دارو بەردو ڕاکردن و چاوشارکێ و خۆشاردنەوەو خۆگەوزاندن و هەڵگەڕان بەسەر کورسی و مێزو دۆلابی ناو ماڵەکەدا، بەکورتی ئەوەیە ئەم منداڵە ناتوانێ بە ڕەحەتی لە شوێنێکدا دابنیشێ بۆ ماوەیەکی زۆر و پێویستی بە جوولان هەیە، هەر کاتێکیش دانیشت لەسەر کورسییەک، ئەوە دەبێت چاوەڕوانی ئەوە بێت ئێستا نا نەختێکی تر دەکەوێتە خوارەوەو کورسییەکە بەسەر خۆیدا دەخات، چونکە جۆلانە بە کورسییەکە دەکات و لەسەر قەراغی کورسییەکە دادەنیشێ. کاتێ منداڵێکی شەش ساڵان سەیری پەرتووک و تەلەفزیۆن دەکات، حەزدەکات لەسەر سک پاڵ بکەوێت، لەبەردەمی دایک و باوکدا و پیشانی دەدات کە ئەم ئیتر سەربەستە و گوێ بە گەورەکان نادات، لەگەڵ ئەمەشدا زۆر دڵنیا نییە لەو سەربەستییەی خۆی و جارجار ئاوڕێک لە دایک و باوکی دەداتەوە، بۆئەوەی دڵنیا بێت لە مانیان لە ژوورەکەدا. ئەم منداڵانە وەکو جاران چاپووک نین لە بەکارهێنانی دەست و قاچیاندا و ئەو کارانەی کە ساڵێک لەوەوپێش بەباشی دەیانکرد ئێستا بۆیان ناکرێ، ئاوکردنە ناو پەرداخێکەوە ئێستا گرانتر بووە بۆیان و دەیڕێژن. قۆپچە داخستنی کراس و چاکەت گران بووە و بۆیان ناکرێ، لەکاتی نانخواردندا چێشتەکە دەڕێژن و خۆیان پیس دەکەن. ئێستا ئەو منداڵە وەکو جاران حەز لە وێنەکێشان ناکات و ڕازی نییە بەوەی دەیکات لەبەرئەوەی ئەگەر وێنەیەکیش بکێشێ دەیدڕێنێ و کاغەزەکە فڕێ دەدات. ئەو بڕوا بە خۆبوونەی پێشووتر هەیبوو ئێستا لە پڕێکا نەماوە و داوای زیاتر لەخۆی دەکات بۆئەوەی کارەکەی باشتر بێت و کە بۆشی ناچێتە سەر ئیتر تووڕە دەبێت و دەگری و بۆڵەبۆڵ دەکات. میزاجی زوو زوو دەگۆڕێ لە نێوانی دەرخستنی سەربەستی خۆی و بە

هەموو شێوەیەک دەیەوێت دەری بخات، کە ئیتر پێویستی بە گەورەکان نییە و لە نێوانی ئەوەی کە لە پاش نەختێ دەیەوێت لە باوەشی گەورەکاندا دانیشێ و خۆی بەبێ توانا دەبینێ. زۆر زوو هەستی بریندار دەبێت کاتێ کە ڕەخنەی لێدەگیرێ و لەهەمانکاتدا خۆی ڕەخنەگرێکی چاکی خۆیەتی و لەخۆی تووڕە دەبێت کە کارێکی بۆناکرێ. لەهەمانکاتدا هەوڵدەدا خۆی هەڵکێشێ و هەندێ جار زیادە بە قسەکانیەوە دەنێ و نەختێ فشەدەکات. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا سنووری نێوانی خەیاڵ و ڕاستی دەزانێ و کاتێ کە تووڕە دەبێت زۆرجار لەم تەمەنەدا زۆر تووڕە دەبێت و لەم کاتانەدا وای لێدێ قسەی ڕەق دەکات بەتایبەتی بەرامبەر بە گەروەکانی نزیکی و جاری وا هەیە بە دایکی دەڵێت (ڕقم لە تۆیە) و (دەتکوژم)، بەڵام بێدەسەڵاتی و جوانییەکەی وا چۆتە دڵی دایک و باوکەوە زۆرجار لێی خۆش دەبن و گوێ بەم قسانەی نادەن. ئەم منداڵە تەندروستی باشترە لەگەڵ ئەو گەورانەدا کە تووڕە نابن و لەسەرخۆن و لە منداڵەکە دەگەن و خۆشەویستی بۆ دەردەبڕن لەگەڵ ئەوەشدا کە بە ڕوون و ئاشکرا سنووری بۆ دادەنێن. چاریەکی وا بۆ تەنگوچەڵەمەکان دەدۆزنەوە، کە هەردوولا بە سەرکەوتوویی ڕزگاریان دەبێت و بە ئەنجامەکەی ڕازی دەبن. لەگەڵ ئەوەی منداڵ لە هەست و نەستێکی ناخۆش و تەنگوچەڵەماویدا دەژی بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەبارەی تێگەیشتنی مێشکەوە زۆر پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینیوە. ئێستا زۆر حەزدەکات، زۆرتر شت بزانێت و زیاتر تاقیکردنەوەکانی فراوانتر بکات. زۆر حەز لەو باسانە دەکات لەکۆندا چۆن بووەو خەڵکی چۆن ژیانیان بەسەر بردووەو لە وڵاتانی تر خەڵک و میللەتانی تر چۆن دەژین. ئێستا گرنگی زیاتر بە ئاژەڵ و ئاسمان و ژینگە دەدات و کەمتر حەز لە حیکایەتی خەیاڵاوی دەکات و زیاتر حەز لە باسی واقعی و ڕاستی دەکات. زۆر پرسیار دەکات وەکو لە ڕاستیدا وایە؟ ئەمە ڕاستە؟ جاران وا بووە؟

ئێستا باشتر بووە لە پلاندانان و تاقیکردنەوەی بیرۆکەی جیاجیا بە شێوەیەکی واقیعیتر بیر دەکاتەوە، ئیتر لەمەودا بیر هەر لە ئێستا و ئێرە ناکاتەوەو کات ئێستا لای ئەم ڕوونترە و باشتر تێیدەگات و ئێستا خەریکە فێری ئەوە دەبێت کاتژمێر چییە و هەندێ لە ئێستاو دواڕۆژ دەزانێ. ئەمە بەوەدا دەردەکەوێ کاتێ .(کە دەڵێت:( کە گەورە بوو، دەیەوێت ببێت بە چی؟

یاریکردن تا ئێستاش ڕۆڵێکی گرنگی لە ژیانی ئەم منداڵەدا هەیە و ئێستا دەتوانێ لەگەڵ منداڵانی تردا یاری بکات و دوای ئەو دەستوورانە بکەوێت کە لە یارییەکەدا هەن و حەز دەکات پیشانی گەورەکانی بدات کە چەند شت دەزانێ. ئێستا فێری ڕاست و چەپ بووە. هەندێجار گزی دەکات لەبەرئەوەی بەلایەوە زۆر نەنگە بدۆڕێنێ، بەڵام زۆر تووڕە دەبێت، کە کەسێکی تری گزی بکات، ئەمە هەندێجار بۆی دەبێتە دروستبوونی تەنگوچەڵەمە. دەستکردن بە قوتابخانە نزیک بۆتەوە و کەسوکار بۆ منداڵەکەی باس دەکەن، کە ئیتر گەورە بووە و بەم زووانە دەست دەکات بە قوتابخانە. منداڵەکە زۆر پێیخۆشە، لەگەڵ ئەمەشدا دەترسێ و تووشی دڵە لەرزێ دەبێت و شەو خەوی لێ ناکەوێت. ڕۆژانی نزیکبوونەوە لە دەستپێکردنی چوونە قوتابخانە ڕۆژانێکی ناسکن بۆ منداڵ و گەورەکان دەبێت ئەوە بزانن، کە ئەمە گۆڕانێکی گەورەیە لە ژیانی منداڵەکەدا و یارمەتی بدەن بەتایبەتی لەم ڕۆژانەدا، هەوڵبدەن تا دەتوانن لەسەرخۆ و بەڕێزەوە لەگەڵ منداڵەکەدا هەڵسوکەوت بکەن، لە یاری و زۆرانبارزی و تووڕەکردنی منداڵەکە کەم بکەنەوە و زیاتر هەوڵبدەن کە کاتی خۆیان تەرخان بکەن بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی منداڵەکە و ئامادەکردنی کەرەسەکانی قوتابخانە، کە بەهەشتێکی سەر زەمینەو ئەو لە پڕێکا هەموو شتێک فێر دەبێت و دەتوانێ هەموو کارێک بکات. چونکە منداڵ وا دەزانێ هەرکە دەستی بە چوونە قوتابخانە کرد ئیتر هەر لە یەکەم ڕۆژەوە فێر دەبێت هەموو شتێک بنووسێ و بخوێنێتەوە و کاتێ کە چووە قوتابخانە دەبینێ ئەم بیرکردنەوەی وانییە تووشی دڵشکاوی دەبێت و وای لێدەکات دڵی بڕەنجێ لە قوتابخانە و مامۆستا و بە ژیانی قوتابخانە ڕازی نەبێت، بەخۆشی ناچێت بۆ قوتابخانە بۆیە ئامادەکردنی منداڵەکە بۆ ڕۆژانی یەکەمی قوتابخانە کارێکی باش دەکاتە سەر چاوەڕوانی منداڵەکە لە مامۆستا و قوتابخانە و یارمەتی دەدات ڕووداوەکانی بە واقعیتر ببینێ و پێیان ڕازی ببێت و نەبێت بەهۆی دروستکردنی گیروگرفتی دەروونی بۆی و بەشێوەیەکی ئاساییتر و لەسەرخۆ بکەوێتە نێو ژیانی قوتابخانەوە.

## بەشی یەکەم

## منداڵ لە تەمەنی 7 تا 12 ساڵاندا

### تایبەتمەندییەکانی ئەم قۆناغە

قۆناغی (7- 12) ساڵان بە زۆر جۆر ناو دەبرێت، وەک ساڵانی کۆمەڵایەتی، ، ئەمەش LATENT ساڵانی شادی، ساڵانی قوتابخانە و ساڵانی لاتێنت دەگەڕێتەوە بۆئەوەی منداڵ زیاتر هەوڵدەدات پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەگەڵ کەسانی دەرەوەی خێزاندا ببەستێت، منداڵ لەم قۆناغەدا کەمترین تەنگوچەڵەمەی هەیە و دڵشاد و بەختەوەرە و زۆربەی کاتی بەخۆشی بەسەر دەبات و دەست بە چوونە قوتابخانە دەکات. شارەزایانی دەروونناسی، ئەم قۆناغە بە قۆناغی لاتێنت ناو دەبەن و وشەی لاتێنیش دەتوانین بە وشەی (نموونە) بەراورد بکەین، بە مانای ئەوەی دایک و باوک نموونەن و زۆر گرنگن بۆ منداڵ، بەڵام هاوکاتیش

زۆر گرنگ نین بۆ چۆنیەتی دروستکردنی کەسایەتی منداڵ وەک لە قۆناغی پێشووتردا. وەک دەبینین ئەم قۆناغە زۆر ناوی هەیە، لەوانەیە لەبەرئەوە بێت بە تەواوەتی زۆری لێ نەزانراوەو لەم بارەیەوە لێکۆڵینەوە زۆر نییە، چونکە وا دەزانن منداڵ پێویستی بە گەورە نییە و خۆیان لەناو خۆیاندا کاری خۆیان ڕێکوپێک دەکەن، گۆڵمەز دروست دەکەن، کەپر دروست دەکەن، مەتەڵ لە یەکتری دادەنێن ، پوول کۆ دەکەنەوە، سواری پاسکیل دەبن و فوتبۆڵێن و پەتپەتێن دەکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گوێ بە ئێمە دەدەن و زۆر ئاگاداری خێزانەکەیانن، دانیشتن لەهەمان شوێندا لەکاتی نانخواردندا زۆر گرنگە، پاسەوانی هەق و هەقداری زۆر گرنگە وەبیرهێنانەوەی دایک و باوک کاتێک زیاتر گرنگی دەدەن بە منداڵی هەرە بچووک لە خێزاندا زۆر گرنگە، دادگا دانان بۆ دایک و باوک کاتێ پارچە گۆشتی منداڵی گەورە کەمترە لە بچووکەکان زۆر گرنگە، هەروەها دایک و باوک دەخرێنە ژێر چاودێرییەوە، نەشیاوە کە ڕەفتاری سەیرو ناباو بکەن جیاواز بێت لە ڕەفتاری دایک و باوکی هاوڕێیانی و دەبێت جلوبەرگی وا لەبەربکەن کە لە جلوبەرگی خەڵکی بچێت و جیاوازییەکی زۆریان نەبێت.

دەتوانین لەسەر ئەم تەمەنە سەیرەی منداڵ بەردەوام بین و باسی لێوە بکەین، هەروەها باس لەو سەرسوڕمانە بکەین، کە دایک و باوکان تووشی دەبن کاتێ منداڵەکەیان دێتەوە ماڵەوە و باسی ئەوە دەکات، جووتێ دەستکێشی تازەو جوانی گۆڕیوەتەوە بە بەردێکی ساف و جوان. لە کاتێکی ئاوادا دایک و باوک هەر ئەوەندەیان بۆ دەمێنێتەوە دەمیان ببێت بە تەڵەی تەقیوو و نەزانن چی بڵێن و چۆن ڕەفتار بکەن. ئەم تەمەنە تەمەنێکی گرنگە و لێرەوە منداڵ مەشق لەسەر ئەوە دەکات هاوڕێیەتیەک لە نێو کۆمەڵ پەیدابکات و دەست دەکات بە کۆکردنەوە و خۆی بۆ ژیانی گەنجایەتی ئامادە دەکات و هەر ئەو مەشقکردنەشە منداڵ لەسەر زۆر شت ڕادەهێنێت لەوەو پێشتر ئامادەنەبووە، گۆرانی لەبەرکردووەو لەبیری ناچێتەوە، فێربووە بەرزترین، درێژترین، کورتترین، پانترین، قووڵترین، ساردترین و قورسترین شت و شوێن چییە و لە کوێیە، هەر لەو تەمەنەدا فێری ئەوە بووە بزانێت (خۆی) کێیە و لەوە بە ئاگایە کە کەسێکە بە کەڵک دێت. پرۆفیسۆری دەروونناسی دکتۆر ئێرش هۆڵمبرگر ئێریکسۆن، لە پەرتووکەکەیدا بە ناوی (تەنگوچەڵەمەی کەسایەتی گەنجان)، نووسیوویەتی: لەم

قۆناغەدا پێویستە منداڵ بەژداری ژیانی کۆمەڵایەتی گەورەکان بکات. پێویستە لە کارەکانیان بگات، پۆلیس، دارتاش، بەننا، ئاسنگەر، جۆلا، بۆڕیچی، کرێکارانی شارەوانی و خۆڵڕشتن، کرێکارانی ئاگرکوژێنەوە...هتد. بۆ منداڵێک لە کۆمەڵگایەکی سەرمایەدارییدا کە تێیدا کار دابەشکراوە، ئەم ئەرکە زیاتر دەکەوێتە سەر قوتابخانە تا قوتابی بۆ پەیوەندیکردن بە ژیانی کۆمەڵایەتییەوە ئامادە بکات، لە کۆمەڵگایەکی لەم چەشنەدا قوتابی لە پێشدا دەبێت فێری خوێندن و نووسین ببێت بۆئەوەی لەم ڕێگایەوە پەیوەندی بە ژیانی دەوروپشتیەوە بکات، ئەو قوتابیەی حەز لە قوتابخانە ناکات و زیرەک نییە بەشێکی زۆری پەیوەندی کۆمەڵایەتیشی لە کیس دەچێت و تووشی تەنگوچەڵەمە دەبێت. هەروەکو لەدواییدا بۆمان دەردەکەوێت منداڵ لەم قۆناغەدا زیاتر لەهەمووکات تینووی زانست و شت فێربوونە. جا ئەگەر گرنگی بەهەردوو دیوی پەروەردەکردنەکە نەدەین، هەر لە ئێستاوە کەسایەتییەکی کزو لاوازمان بۆ دروست دەبێت.

منداڵ لەم تەمەنەدا باڵای خۆی بە باڵای کارەکەی دەپێوێت و دەیەوێت بیسەڵمێنی کە دەتوانێ کاری ڕاست بکات. هەروەکو چۆن گەورەکان کار دەکەن بۆ ئەوەی پێی بژین، هەروەها ئەم منداڵەش وا سەیری کارەکەی خۆی دەکات، منداڵ بەجارێ سەری قاڵە و ئاگای لە دەوروپشتی خۆی نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا واز لە کارەکەی دەهێنێ و ناڕازییە، چونکە وا هەست دەکات ئەم کارەی دەیکات گرنگ نییە و وا دەزانێت کارەکەی بەباشی ڕاناپەڕێنێت و کەس پێویستی بەم نییە، منداڵ کاتێک هەست دەکات کارەکەی خراپ و ناگرنگ و پێویست نییە، تووشی هەستی نا ئومێدی دەبێت، کە لەوانەیە لەگەڵ منداڵەکەدا تا گەورەبوونیش بەردەوام بێت و ڕێگای کار و پێشکەوتنی لێ بگرێت و کەمتر شانازی بە کارەکەیەوە بکات. منداڵ لەم قۆناغەدا دەیەوێت پەیوەندی خۆی لەو پەیوەندییە فراوانتر بکات، کە بە دایک و باوکیەوە هەیەتی و لە خەڵکی تریشەوە شت فێر دەبێت. مامۆستا کە ڕێز و متمانەی کۆمەڵی هەیە، دەبێت بە نموونەیەکی زیندوو و نیشانەیەکی دیار بۆ منداڵەکە و لەڕێی ئەوەوە تێدەگات کە ئەمیش بۆ کۆمەڵەکەی بە کەڵکە، بەڵام ئەگەر پەیوەندی منداڵ تەنها بریتی بێت لە پەیوەندی قوتابخانەو ماڵەوە، کاری قوتابخانە ئەوەندەی تر گرانتر دەبێت و مامۆستا بە تەنها ناتوانێ کاری خۆی بە سەرکەوتوویی بباتە سەر ئەگەر کۆمەڵ یارمەتی نەدات.

چۆن کۆمەڵ لەم پێشکەوتنەدا یارمەتی منداڵ دەدات، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دەستی یارمەتییەی لە نێوانی قوتابخانە و خێزاندا و لەنێوان قوتابخانەو دامودەزگاکانی تری وڵاتدا درێژ دەکرێت، تەرخانکردنی بەشێکە لە کاتی دایک و باوک تا کۆمەڵ بە منداڵەکەیان بناسێنن لە ڕێگەی بردنی منداڵەکەیان بۆ شوێنی جیاواز و فێرکردنی چۆن چارەسەری تەنگوچەڵەمە جۆراوجۆرەکانی ژیان دەکات، یاخود یارمەتی نێوانی قوتابخانەو کارگەکان و چوون بۆ میوانداری و ڕوونکردنەوەی جۆری کارەکانیان بۆ قوتابیان بۆئەوەی قوتابی بتوانێت بەلای کەمەوە بزانێ لە دواڕۆژدا چ ڕێگایەک دەگرێتەبەر. هەموو پیشەیەک لەم تەمەنەدا بۆ منداڵ خۆشە و بەلای ئەمەوە جیاوازی نییە، کە ئاگر کوژێنەرەوە بێت یان جووتیار، یان باخەوان، بۆیە پێویستە کارگە و دامودەزگاکانی تر دەرگاکانیان بۆ منداڵانی سەرەتایی بخەنە سەر پشت و هەفتەیەک بەپێی ڕێکەوتنێک لەنێوانی قوتابخانەو ئەو شوێنانەدا پۆلێک لە قوتابیان میوانداری ئەو شوێنانە بکەن و چاکە و خراپەی ئەو شوێنانە چین و کارەکان چەند گرانن یان ئاسانن و باری تەندروستی کرێکارەکان و چۆنیەتی ژیانیان و زۆر باسی تر، کە قوتابیان لە پێشەوە خۆیان بۆ ئامادەکردووە و کە پرسیار لە بارەیەوە بکەن، هەموو ئەمانەیان بۆ باس بکرێت.

هەروەها قوتابخانە دەتوانێت سوود لە پیاوە پیرو بە تەمەنەکانی ناوچەکە وەربگرێت و داوایان لێ بکات سەردانی قوتابخانە بکەن و باسی کاری خۆیان و ژیانی خۆیان بۆ قوتابیان بکەن، زۆرجار پیاوێکی سادەی کارزان ئەوەندە شارەزایە لە قسەکردن و گێڕانەوەی سەرگوزشتەی ژیانی خۆی، منداڵان بە بیستنی شاد دەبن و بەڕاستی گوێی لێدەگرن. هەندێک لەم کارمەندانە ئەوەندە دامودەزگاکەیان بۆ گواستنەوە سووکە دەتوانن هەر لە پۆلدا کارەکەیان پیشانی قوتابیان بدەن وەکو: کڵاش چنین، پینەچیەتی و کڵاو دروون و کەوچک و شانە دروستکردن ....هتد. یا بۆ بە دڵی منداڵێک نەکەین و یارمەتی نەدەین کاتێک دەیەوێت ببێت بە ڕۆژنامەنووس و شوێنێکی بۆ تەرخان بکەین لە یەکێ لە چاپخانەکاندا کە چەند جارێک ڕێگای بدرێت بچێت بۆ چاپخانەکە و ڕۆژنامەیەک ئامادە بکات، با لاپەڕەیەکیش بێت. ئیتر لەم بارەوە قوتابخانە دەتوانێت کاری گەورە بکات و مێشکی منداڵان بورووژێنێ بۆ بیرکردنەوەو و بەراوردکردن و فێربوون کە لە ڕاستیدا ئەمەیە کاری سەرەکی قوتابخانە.

لەشولاری منداڵ چۆن پێشدەکەوێت

سالاَن، تەمەنێکی پڕ لە گۆڕانە لە جەستەی منداڵدا، لەم کاتەدا لەشی (7 -6) منداڵ خۆی دەکێشێتەوە و قاچەکانی بە بەراورد لەگەڵ لەشیدا درێژتر دەبن، سەری بچووکتر نابێت، بەڵام وا دەردەکەوێت کە باشتر لەگەڵ لەشیدا ڕێک دەکەوێت. جوولانەوەی دەست و قاچی پێشتر دەکەوێت، دەستی باشتر شت دەگرێت. پەیوەندی نێوان ئەوەی بە چاو دەیبینێت و بە دەست دەیکات باشتر دەبێت، لەبەرئەوەی دەبینین منداڵ لە دەقیقەیەکدا چەند جارێک خۆی دەکێشێتەوە، ئەو توانایەی کە پێشتر هەیبوو بۆ ئەوەی بتوانێت بە جوانی نان بخوات ون دەبێت و دوایی دەگەڕێتەوە. کاتێک ئەم گۆڕانانە بەسەر منداڵدا تێپەڕین و منداڵ گەیشتە تەمەنی حەوت ساڵی ئیتر پارسەنگییەکی تەواو لە نێوان ئەندامەکانی لەشیدا پەیدا دەبێت، حەوت ساڵانێک دەتوانێت شەق لە تۆپێک هەڵبدات، تیروکەوان بەکاربهێنێت، پەتپەتێن بکات، مەلە بکات و سواری پایسکیل ببێت، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا نابێت بەرەڵا بکرێت و بەتەنها بەجێ بهێڵرێت، چونکە تا ئەو کاتەش ناتوانێت پێوانەیەک بۆ ماوەی نێوان شتەکانی دەورووبەری دابنێت و ڕاست و چەپ لەیەکترجیابکاتەوە.

کاتێک کە هەموو ئەو شتانە ڕوودەدەن لە لەشی منداڵدا، زۆر گۆڕانی گرنگیش لە دەروونی منداڵدا ڕوو ئەدەن، کە کار لە هەموو ژیانی پێشکەوتنی منداڵ ئەکەن و ئەبن بە بەردی بناغەی هەموو پێشکەوتنێک لە ژیانی دواڕۆژیدا، لەبەرئەوە وەکو پەروەردەکار دەبێت بەشداری ئەو پێشکەوتنەی منداڵ بکەین و یارمەتی بدەین بۆئەوەی ئاسانتر بتوانێت خۆی پێش بخات . دەتوانین بەشداری و یارمەتیدانی پەروەردەکار بۆ پێشکەوتنی هەست و نەستی منداڵدا لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆبکەینەوە:

1- بیرکرنەوەی منداڵ:

پێش حەوت ساڵان منداڵ تەنها بیر لە خۆی دەکاتەوە و زۆر گوێ بە دەورووبەرەکەی نادات. ئەمە نابێت وا لێکبدرێتەوە کە منداڵەکە خۆپەرستە و تەنها ئەو مانایەی پێ بدەین. ئەم خۆپەرستیەی منداڵ هۆیەکە بۆ ئەوەی منداڵ منداڵ پڕە لە تێڕامان و بتوانێت یان هەوڵبدات کە جیهانی دەورووبەری لێوردبوونەوە، بەڵام منداڵ هەتا ئەم کاتەش بەتەواوەتی بۆی ڕوون نەبۆتەوە کامە لەو شتانەی دەورووبەری هی خۆیەتی یان کامیان هی خۆی نییە، هەر لەبەرئەوەشە کە بەئاسانی شتەکانی دەورووبەری لێ تێکەڵ دەبێت و ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی منداڵ خۆی بە ناوەند یان چەقی جیهان دەزانێت.

منداڵ پێش حەوت ساڵان وا دەزانێت، کە هەموو شتێک تەنانەت شتی بێگیانیش وەکو بەرد، ئاسن، دار، ئۆتۆمبێل و شەمەندەفەریش ژیانی تایبەتی خۆیان هەیە و وەک ئەو دەژین. ژان پیاشێ پرۆفیسۆرێکی سویسرایی بەناوبانگەو نموونەیەکی کۆن بۆ ئەم بیرگۆڕینە دەهێنێتەوە. ئەگەر دوو پەرداخی وەکو یەک بخەینە بەردەمی منداڵێک و وەکو یەک ئاویان تێ بکەین، دوایی یەکێک لە پەرداخەکان بگۆڕین بە پەرداخێکی باریکتر و بەرزتر و هاوکات پرسیار لە منداڵەکە بکەین، کە لە تەمەنی (بیر لە خۆ کردنەوە) دایە، ئایا لە پەرداخێکدا چ ئاو زیاتر هەیە، وەڵامەکەی ئەوە دەبێت کە لە پەرداخە بەرزەکەدا ئاو زۆرترە، منداڵ تا ئێستاش هەر بەوەوە سەری قاڵە کە دەیبینێت. لەبەرئەوە لەبەرچاوی زیاتر ئاو لەناو پەرداخە بەرزەکەدایە، بەڵام ئەگەر لەدوای تەمەنی حەوت ساڵان پرسیار لە منداڵەکە بکەین، ئەوا دەڵێت: هەردوو پەرداخەکە وەکو یەک ئاویان تێدایە. چونکە منداڵەکە ئێستا دەتوانێ بیر لەو زنجیرە ڕووداوانە بکاتەوە کە ڕووی داوەو بە یەکیانەوە ببەستێتەوە. بە مانایەکی تر دەتوانێت (هۆ و ئەنجام) بەیەکەوە ببەستێ، دەتوانێ باسێک شی بکاتەوە بۆ پارچەی بچووک بچووک و دواتریش بیکاتەوە بە یەک. بۆ نموونە : 7 – 3 = 4 و 4+ 3 = 7 ، بەمە منداڵ خۆی بۆ بیرکردنەوەی دوولائەنە

ئامادە کردووە. کاتێک منداڵەکە تێدەگات کە دوو پەرداخەکە وەکو یەک ئاویان تیایە هەرچەندە لە یەکیش ناچن ئەمە مانای ئەوەیە، کە شتێکی گەورەی پشکنیووە، جارێک لەجاران لەزووتردا هەمان پشکنینی کردووە. کاتێ کە بۆی دەرکەوت ئەو شتەی لەژێر دەستەسڕەکەدا شاردرابووەوە ئێستا لە شوێنێکی ترە.

منداڵەکە فێر بوە کە شتەکە هەیە هەرچەندە لەژێر دەستەسڕەکەدا نییە، ئەمە لە تەمەنی هەشت مانگیدا بوو، ئەمە هەر یەکەیان پلەی جیاواز و ناوی جیاوازی هەیە. لەگەڵ ئەمەشدا حەوت ساڵان تا ئێستاش هەر لە شتی بەرجەستەدا دەتوانآ دەست بەسەر بیری خۆیدا بگرێت و ناتوانێ بیر لە شتێک بکاتەوە کە بەلایەوە نەبێت یاخود بە خەیاڵ دروستی بکات. ئەمەیان لە تەمەنی باڵقیدا دەردەکەوێت، ئەگەر بە حەوت ساڵانێک بڵێیت وا بیر بکاتەوە کە خەڵوزێکی سپی هەیە ئەوا خێرا وەڵامت دەداتەوە، کە ئەمە نییە و شتی وا نابێت، بەڵام دوازدە ساڵانێک گوێ ناداتە ئەوەی کە ئایا خەڵوزەکەی تۆ باسی دەکەیت ڕەشە یان سپی و بەلایەوە گرنگ نییە و لە تەمەنی یازدە ساڵاندا منداڵێک دەتوانێ وا بیر بکاتەوە:

هیرۆ سپیترە لە هاژە

هاژە ڕەشترە شەوبۆ

کێ سپیترە؟

دوانزە ساڵێک حەز دەکات کە ئەمجۆرە تەنگوچەڵەمانە بزانێت و یاری بە بیری خۆی بکات، دەتوانێ جیهان هەڵوەشێنێتەوە و لەبیری خۆیدا وەکو خۆی دەیەوێت دروستی بکاتەوە، بەڵام حەوت ساڵانێک دەبێت شت بە چاوی خۆی ببینێت ئینجا ڕازی دەبێت و بڕوای پێدەکات. لە ماوەی ئەم چەند ساڵەدا لە حەوت ساڵیەوە تا دوازدە ساڵی گۆڕانێک لەبارەی باشتربوونی(خۆیی)بیری منداڵەوە ڕوودەدات.

قسەکردن: (گفتوگۆکردن )
ئەوەی لەبارەی بیری منداڵەوە لێی دواین ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە توانای منداڵەوە هەیە بۆ قسەکردن، قسەکردن لەگەڵ منداڵێکی حەوت تا دوازدە ساڵی دەگۆڕێت و دەبێت بە گفتوگۆکردن، لە پێشووتردا منداڵ لە قسەکردندا لەگەڵ منداڵانی هاوتەمەنی خۆیدا و لەگەڵ گەورەکاندا یەک لەدوای یەک بیری خۆی دەربڕیوە بەبێ ئەوەی گوێ بداتە پەیوەندی نێوانیان یاخود بیر لەوە بکاتەوە کە خەڵکی لە چ ڕوانگەیەکی ترەوە دەبینێت و تا چ ڕادەیەک جیاوازە. قسەکانی منداڵ لەم قۆناغەدا بریتین لە هەزارو یەک پرسیار کە بە ئاسانی وەڵامیان

نادرێتەوە. لە تەمەنی حەوت ساڵییەوە، بەپێی توانای گەورەکان و ڕادەی
قسەکردنیان لەگەڵ منداڵدا زمانی منداڵ پێشدەکەوێت و توانایەکی بەرامبەر لای
منداڵ دروست دەبێت کە بتوانێت بە ئاسانی خۆی بخاتە شوێنی کەسێکی ترەوە
و بە چاوی ئەو سەیری مەسەلەکە بکات. ئەمە وا دەکات کە قسەکردن لەگەڵ
منداڵێکی حەوت تا دوازدە ساڵان بگۆڕێت بۆ گفتوگۆکردن و منداڵ لەسەرئەوە
ڕادەهێنرێت کە مەشق لەسەر گفتوگۆی گرانتر و بەنرختر بکات، بۆیە کە
مامۆستا لە پۆلی یەک و دوودا ڕووبەڕووی ئەمجۆرە گفتوگۆیە نابێتەوە لەنێوان
خۆی و منداڵەکاندا، یان لەنێوان منداڵەکان خۆیاندا، چونکە هێشتا ئەم توانایە لای
منداڵەکان پێ نەگەیشتووە، لەوانەیە یەکێک لە قوتابییەکان بە هاوڕێیەکی بڵێت:(
سەیرکە چ ڕەنگێکی جوانم بەرکەوت) و هاوڕێکەی وەڵامی بداتەوە:(
ڕەنگەکەی من تەواو بوو). ئەمانە بەیەکەوە قسە ناکەن، بەڵکو قسە بە تەنیشت
یەکدا دەکەن و قسە بەسەر قسەی یەکتردا دێنن، کاتێ کە منداڵێک دەڵێت: برزۆ
پێڵاوەکانی خستمە ناو جۆگەلەی ئاوەکەوە، یەکێکی تریان لەولاوە دەڵێت: کە لە
جۆگەلەیەکی ئاو بەبەر ماڵی ئێمەدا دەڕوات. ئەمجۆرە قسەکردنە بە مۆنۆلۆژی
بە کۆمەڵ ناو دەبرێت و پلەی یەکەمی گفتوگۆکردنە و ئەوەندە ناخایەنێت کە
منداڵەکان ئەم پلەیە بەجێ دەهێڵن و لەبەشی دووەمی پۆلی دوودا فێری گوێ
لەیەکتر گرتن دەبن و بەشداری لەو باسانەدا دەکەن کە هاوڕێکانیان قسە لە
بارەیانەوە دەکەن. ئێستا با پرسیارێک لە خۆمان بکەین، ئایا منداڵ دەبێت لە
پۆلدا قسە بکات؟ ئایا ئەگەر هەر دانیشێ و قسە نەکات هیچ فێر دەبێت؟ زانست
چییە؟ زانست بۆ ژیان؟ ئایا ئەم زانستە ئەوە ناگەیەنێت کە ڕێ بە مرۆڤ بدرێت
هەستی و نەستی خۆی لە شوێن و کاتی جیاوازدا و بەوجۆرەی کە خۆی
دەیەوێت دەرببڕێت؟ ئایا زانست ئەوە نییە کە باسی ئەو ژیانە بکەیت و بتوانیت
بە خەڵکی دەورووپشتت ڕابگەیەنیت کە تۆ چۆن ژیاویت و چیت کردووە؟
شتێک لە ژیانی مرۆڤدا کە ڕوویداوە تەواو نابێت تا ئەو مرۆڤە باسی نەکات بۆ
خەڵکی ترو سەرنجیان بۆ ئەوە ڕانەکێشێت کە ئەوانیش بەشداری ئەم ژیانەی
بکەن، منداڵ کە قسە دەکات گەورە دەبێت.
لە پۆلەکانی یەک و دوو و سێدا منداڵ زەوقی فێربوونی هەیەو دەتوانێت ئەم دوو
ئامانجە بەیەکەوە ببەستێ و دەتوانێت مەشقی قسەکردن و ماتماتیک بەیەکەوە
بکات، لێرەدا کە دەڵێین زەوق لەبەرئەوەی لە قۆناغی دوایتردا ئەم زەوقە ون

دەبێت، کە لە وانەیە بەهۆی ئەوەوە بێت کە ئەو هەزارەها دەنگوباسەی لە مێشکی منداڵدا دەخولێنەوە پێشتر بۆی نەڕەخسابێت دەریانبڕێت، ئەمەش بەهۆی ئەو سیستەمەی کە مامۆستا بەکاری دەهێنێت لە پۆلدا کە پۆل دەبێت بێدەنگ بێت و منداڵان دەبێت ڕێکوپێک دابنیشن و ئەوەی بجووڵێتەوە ئەوە منداڵێکی هارەو بە چاوی سووک سەیری دەکرێت. لەم کاتەدا کە منداڵ مامۆستا بە نموونەی بەرزی خۆی دەزانێت. زۆر ئاسانە بە گوێی مامۆستا بکات، زیاتریش لەوەی کە داوای لێدەکرێت بیکات، بۆئەوەی خۆشەویستی مامۆستاکەی لە کیس نەچێت، ئەمە زیانێکی یەکجار زۆر بە منداڵ دەگەیەنێت و هەر لە ئێستاوە بەسەرشۆڕی بۆ کەسێکی تر ڕادەهێنرێت و خوی ئەوە دەگرێت کە بە گوێی هەموو کەسێک بکات. بێگومان هیچ مامۆستایەک نییە کە بیەوێت منداڵی وا پەروەردە بکات و بیەوێت کەسێکی ژێردەستە و ملکەچ بهێنێتە بەرهەم، کە دوور نییە لەدواڕۆژدا بۆخۆی بکەوێتە ژێر باری ژێردەستەیی ئەوانەوە، کە خۆی پەروەردەی کردوون. ئەم قسەکردنەی ناو پۆل نابێت لە شێوەی غەڵبەغەڵب و هاواردا بێت، بەڵکو دەبێت لە شێوەیەکی ڕیکخراودا بێت و منداڵ فێری ئەوە ببێت چاوەڕوانی وەڵامی یەکتر بکەن، یاخود بە یارمەتی مامۆستا لەسەر سیتەمێک ڕێک بکەون. لەم بارەیەوە جۆری دانانی کورسی و مێز لە پۆلدا گرنگییەکی یەکجار زۆری هەیە. لە قوتابخانەکانی ئێمەدا کورسییەکان بە جۆرێک دانراون کە قوتابییەکان هەموویان ڕوویان لە مامۆستایە و مانای ئەوە دەدات بە قوتابیەکان کە قسەکردن تەنها لەگەڵ مامۆستادا بکرێت. هەرچەندە هەندێجار قوتابیان هەوڵدەدەن قسە لەگەڵ یەکتردا بکەن، بەڵام ئەمە دەبێت بەهۆی ناڕەزایی هەندێک . ئەگەر بێت و کورسییەکان وا دابنرێت کە قوتابیەکان بە کۆمەڵ کۆمەڵ و بەشێوەی جیاواز دابنیشن. بەجۆرێک کە ڕوویان لە یەکتر بێت، ئەوا دەتوانن ئەو پارسەنگییە بدۆزنەوە لەنێوان پەیوەندی لەگەڵ یەکتردا و پەیوەندی لەگەڵ مامۆستادا و ئاسانتر ئەم کارە ڕێکوپێک بکەن، قوتابییەکان دەبێت لە بڕیاردان لەسەر ئەو جۆری سیستەمەی کە لەسەری دەڕۆن بەشدار بن. ئەمەش ڕێگایەکی باشە بۆئەوەی کە قوتابیان فێری دەربڕینی هەستونەستی خۆیان بن. دەکرێت ئەو پەیوەندییە بە جۆرێک ڕێک بخرێت هەموو ڕۆژێک وانەی یەکەم دابنرێت بۆ قوتابیان تا پێکەوە دابنیشن و لەگەڵ یەکتردا بدوێن و باسی ئەوە لەگەڵ یەکتردا بکەن، کە ڕۆژەکەیان چۆن بەسەر بەرن و لەو تەنگوچەڵەمانە بکۆڵنەوە کە

لەوانەیە بێتە ڕێگایان، یان ئەو تەنگوچەڵەمانەی ڕۆژی پێشووتر لەنێوانیاندا ڕوویداوە. هەروەها دەکرێت نیو ڕۆژ لە هەفتەدا دابنێین بۆئەوەی باسی ئەو تەنگوچەڵەمانە بکەن کە ڕوویان داوەو ڕێگا چارەی بۆ بدۆزنەوە. بێجگە لەمە دەبێت مامۆستا لەکاتی ڕوودانی هەر تەنگوچەڵەمەیەک کە لەنێوانیاندا ڕوویداوە بۆ چارەسەرکردن ئامادەبێت و بەزووترین کات بە دەنگ قوتابیانەوە بێت و کاتی تەواو بۆ دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو تەرخان بکات و نەهێڵێت کە گرفتەکان کۆن ببن و ڕاستەوخۆش هەوڵی ئەوە بدات کە قوتابیەکان خۆیان بەشداری بکەن و گرنگیش بەڕاو بۆچوونی هەر یەکێک لە قوتابیەکان بدات. سەرجەمی ئەم خاڵانە گرنگی تایبەتی خۆیان هەیە و بریتین لە قسەکردن و جۆری قسەکردن و گفتوگۆکردن کە منداڵ لەسەر جۆرێک لە دیموکراتییەت ڕادەهێنێت، هەروەها فێریان دەکات چۆن هەقی خۆیان و هەقی خەڵکی لەیەکتر جیابکەنەوە و چۆن ڕێز لەو یاساو دەستوورانە بگرن کە لەنێوان خۆیاندا لەسەری ڕێککەوتوون، ئەمانە هەموویان بەشە پێکهێنەری زانستی کۆمەڵایەتین و بۆ ژیان لەناو کۆمەڵدا پێویستن.

3- پلاندانان، پارمەتیدان، بڕیارو دیالۆگ:

لەناو خێزاندا گرنگترین مەشق بۆ بەیەکەوە بیرکردنەوە دەکرێت بەتایبەتی لە کاتی نانخواردن، کاتی پێش نووستن و کاتی دوای تەواوبوونی پرۆگرامی ڕادیۆ و سەیرکردنی تەلەفزیۆن و سەیران و شایی و زۆر کاتی تر. منداڵ لە تەمەنی حەوت تا دوازدە ساڵی پێویستی بە بەشداربوون لەهەموو پلاندانانێک لەناو خێزاندا هەیە. لە زۆر خێزاندا کە لەم بارەیەوە گەیشتوونەتە ئەنجامێک تەنانەت منداڵی بچووکتریش بەشداری لە پیلاندانان و گفتوگۆی ڕۆژانەی نێو خێزاندا دەکەن. لەبەرئەوەی منداڵ لەم تەمەنەدا گۆڕانێکی گەورەی بەسەردا دێت چ لە بارەی بیرکردنەوە لەخۆی و چ لەبارەی بیرکردنەوەوە لە دەوروپشتەکەی و دەتوانێت لە سووچی جۆراوجۆرەوە سەیری مەسەلەکان بکات، بۆیە پێویستی بە مەشقکردن هەیە تا بتوانێت بەرپرسیارەتی بڕیارەکانی خۆی لە ئەستۆ بگرێت،

لە ڕێگای ئەم بەشداربوونەوە منداڵ بەڕاستی و بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە جیهانی گەورەکان ئاگادار دەبێت و تێیدەگات. لەهەمانکاتیشدا گرنگیی خۆی بۆ دەردەکەوێت و ترسی خۆ بەکەمزانینی نامێنێت، کە لەم تەمەنەدا زۆر مەترسی ئەوە دەکرێت هەست بەو ترسە بکات. بەڵام هەموو پلاندانانێک کاتی دەوێت و تەنانەت زۆرجار کاتێکی زۆریشی دەوێت پێویستە لەدوای هەڵسەنگاندن و باسکردن و گفتوگۆکردن و پرسیار و وەڵامێکی زۆر بڕیاری لەسەر بدرێت. لە کاری ڕۆژانەی مامۆستایەک یان دایک و باوکێکدا چەند جارێک بڕیار دەدرێت و ئەو کەسەش کە بڕیارەکە دەدات تەنها دایک و باوک یان مامۆستاکەیە و ئەوەی کە بڕیارەکەش جێبەجێ دەکات قوتابییەکەیە. لەڕۆژێکدا چەند بڕیاری چەوت دەدرێ لە پۆلدا؟ مامۆستا خۆی بۆ تووڕە دەکات و دەڵێت: بەسە ئیتر قسەم ناوێت ، هەستە ئاسۆ بۆ دەرەوە یان کە زۆر تووڕە دەبێت، ئەوە چەکی دەستی دەبێت بە تاقیکردنەوە و دەڵێت : پەڕە دەر هێنن تاقیکردنەوەیە، ئەمانە و گەلێک شتی تر مامۆستا بە تەنها بڕیاریان لەسەر دەدات و بڕیارەکەش پێویستی بە کات بەسەر بردن نییە و کاری خۆی دەکات، بەڵام چ کارێک**!!** ئەوکاتەی کە دەتوانرا بەیەکەوە لەگەڵ قوتابییەکاندا بۆ پێشکەوتنی مێشک و دەروونیان ببرێتە سەر لەکیس دەچێت و بەمە هەموو کاتەکە بەفێڕۆ دەڕوات و کە کاتیش بەفێڕۆ چوو، ئیتر دەبێت مانای ژیان چی بێت؟

مامۆستایەک بۆی گێڕامەوە: دەرسێکم هەبوو لە پۆلی یەکەم لەنێو کاتژمێری یەکەمدا پیلانمان داناو لە دە دەقیقەی دواییدا وانەمان هەبوو، ئەمە چۆن بوو، مامۆستای پۆلێک داوای لێکردم کە دەرسێک بچمە لای قوتابییەکانی پۆلەکەی ئەو و پێشتر لە منداڵەکانی پرسی بوو: ئایا بەوە ڕازین کە بچمە لایان، ئیتر من چووم بۆ پۆلەکەیان، بەڵام چی بکەین؟ پرسیارم لە منداڵەکان کرد. منداڵەکان وتیان : چی هەیە بیکەین؟ منیش وتم ، کەواتە با لە پێشدا بزانین چی بکەین، پێشنیاری یەکەم: منداڵێک وتی هاروهاجی بەسەرو سیمای قوتابییەکەدا وا دیاربوو کە زۆر سەری سووڕما کاتێک بە خەتێکی ڕێکوپێک پێشنیارەکەی ئەوم لەسەر تەختەڕەشەکە نووسی. پێشنیاری دووەم، قوتابییەکی تر وتی: تۆ حکایەتێکمان بۆ بخوێنەرەوە، ئێمەش دوایی ڕەسمی دەکەین، ئەم پێشنیارەشم، وەکو پێشنیاری پێشوو لەسەر تەختەڕەشەکە نووسی پێشنیاری تر: لە بازنەیەکەدا دادەنیشین و قسە دەکەین، ئەم پیشنیارەشم نووسی، پێشنیاری تر**!!** کەس

پێشنیاری نەبوو. ئیتر کاتی ئەوە هات کە دەنگ بدەین و بۆم باسکردن ئەمە لەوە دەچێت دایک و باوک لە کۆبوونەوەدا دەیکەن و وشەی کۆبوونەوەم لەسەر تەختەڕەشەکە نووسی و بۆم باسکردن ئەمە لەوە دەچێت، کە لەپەرلەمان دادەنیشن و دەنگ دەدەن، وشەی دەنگدام نووسی، ئیتر کاتی ئەوە هات کە دەنگەکان بژمێردرێن و باسی ئەوەم بۆ کردن کە هەر کەسەی هەقی هەیە یەک دەنگ بدات و وشەی (دەنگ)م نووسی، بەو مانایەی کە هەر قوتابییەک بۆی هەیە یەکجار دەست بەرز بکاتەوە. لەمەوە فێری دەنگ ژماردن بوون و دوو دەنگژمێرمان هەڵبژارد تا دەنگەکان بژمێرن و لێپرسراوی ئەم کارە بن. هەر یەکە لە پێشنیارەکان چەند دەنگێکی وەرگرت، هاروهاجی: 4 دەنگی وەرگرت، ئەو پێشنیارەی، کە زۆرترین دەنگی وەرگرت، ئەو پێشنیارە بوو، کە دەڵێت: تۆ حیکایەتێکمان بۆ بخوێنەرەوە و ئێمە وێنەی دەکێشین، بەڵام ئەگەر هاروهاجی سەر بکەوتایە! چیم بکردایە! هیچ گومانێکی تێدا نییە هاروهاجیمان دەکرد، بەڵام هاروهاجی دەبێت پیلانی بۆ دابنرێ، هاروهاجی چییە و دەبێت چی بکەین؟ زۆر دڵنیام لەوەی، کە دەمانتوانی گفتوگۆیەکی بە کەڵک لەم بارەیەوە بکەین و زۆر شتی باشی لێوە فێر ببین.

ئێستا دەبوو ئەو پێشنیارە جێبەجێ بکەین، کە سەرکەوتبوو، بەڵام هەندێ لە قوتابییەکان نەیادەویست ئەمە بکەن، یەکێک لە پشنیاری ئەوەی کرد کە هەر کەسە چی دەوێت با ئەوە بکات لێرەدا باسی زۆربەو کەمایەتیمان کرد، کە چۆن لە بڕیاری دیموکراتیدا کەمایەتی دەبێت سەر بۆ بڕیاری زۆربە دانەوێنێت و نموونەم بۆ هێنانەوە، کە چۆن لەپەرلەماندا ئەم کارە دەکرێت، کە زۆرجار لە پەرلەماندا ئەندامەمان هەن ڕازی نین بەو بڕیارەی، کە دەدرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر بەگوێی بڕیاری پەرلەمان دەکەن و بەپێی بڕیارەکان کارەکان بەڕێوە دەبەن. یەکێک لە قوتابییەکان وتی : ئەی ئەوە چییە خەڵکی ماندەگرێت و کارناکات! ئیتر باسی مانگرتن و دەستووری مانگرتنمان کرد و ئەوانەی کە مانیان گرت چەند کەسێک بوون و بۆ خۆیان دانیشتن و وەکو ئێمەیان نەکرد کە زۆربەی زۆری پۆلەکە بووین و دەستمان کرد بە وانەی خۆمان. منیش حیکایەتێکی کۆنم بۆ خوێندنەوە، کە ئەوەندە درێژ نەبوو بەو دە دەقیقەیەی کە مابووەوە تەواو دەبوو، کاتێک کە وانەکە تەواو بوو، سێ وێنەی جوانم پێشکەش کرا وەکو دیاری و یەکێکی تر کە تەنها لەسەر لاپەڕەکەی نووسیبووی: وەرەوە

بۆ لامان ، ئەمە بوو وانەی مامۆستاکە و هەموو پەروەردەکارێک تێدەگات کە چەند وانەیەکی بەکەڵک بووە.

4- دەستوورو یاسا

کاتێ منداڵ لە تەمەنی 7 – 12 ساڵیدایە، دەستوری جیاواز دێتە ژیانیەوە، ئێستا منداڵ تێدەگات بۆچی یاسا و دەستوور بۆ کۆمەڵ دانراوە، پێش حەوت ساڵی منداڵ وای دەزانی کە گەورەکان بڕیاری ئەم یاسا و دەستوورانەیان داوە کە منداڵ لە کات و شوێنی جیاوازدا دەبێت چۆن و چی بکات، لەدوای حەوت ساڵی، یاسای بەیەکەوە ژیان لەگەڵ منداڵدا دەکەوێتە کارو ئەم یاسانە دەبێت وەکو یەک ڕەچاو بکرێن چ بۆ منداڵ و چ بۆ گەورە. لەم تەمەنەدا منداڵ زیاتر ڕەخنە لە کۆمەڵ دەگرێت و پاسەوانی هەق و ڕاستییە، بەلایەوە ناڕەوایە مامۆستا لە ژووری مامۆستایان دابنیشێ و شیرینی بخوات، لەکاتێکدا کە بە منداڵەکان دەڵێت: نابێت شیرینی بخۆن چونکە بۆ ددانتان خراپە. شتێک هەیە لەپێش تەمەنی حەوت ساڵیدا لەلای منداڵ لە یاسا و دەستوور دەچێت ئەویش ئەوەیە منداڵ ئەو کردەوانە دووبارە دەکاتەوە، کە گەورەکان دەیکەن، ئەمە زیاتر پەیوەندی بە خۆوەوە هەیە کە منداڵان هەوڵدەدەن بەم هۆیەوە ژیانی خۆیان دابین بکەن. ئەمە یارمەتی منداڵ دەدات، کە خۆی لەشتی تازە بپارێزێت، یان خۆی لەوە بپارێزێت، کە خۆی بەپێی کات و شوێنی تازە بگۆڕێت، چونکە جیهانی منداڵ ئەوەندە شتی تازەی تێدایە منداڵ ئەگەر بەهۆی ئەم خووانەوە خۆی نەپارێزێت ناتوانێت ژیان بەسەر بەرێت. لەو یاریانەی، کە منداڵ دەیانکات بە ئاشکرا دەبینین چۆن لەنێوان تەمەنی (3- 7) و (7 – 12) ساڵاندا ، منداڵ پێشدەکەوێت ژیانی منداڵ پڕە لە یاری، کە هەر یەکە و دەستوور و یاسای خۆی هەیە. هەڵماتێن، هەلوکێن، قەڵەمرداری، فوتبۆڵێن و زۆر یاری تریش کە هەندێکیان لەگەڵ منداڵاندا تا تەمەنی گەنجێتیش دەمێننەوە و نابێت یاسا و دەستوورە تایبەتیەکانیان بگۆڕدرێن. منداڵ کە لە پێش تەمەنی حەوت ساڵیدا یاریی هەڵماتێن دەکات، دەیەوێت لاسایی هاوڕێ گەورەکانی بکاتەوەو تەنها هەندێک لە دەستوورو یاساکانی هەڵماتێن و دەزانێت و بەلایەوە گرنگ نییە کە

هاوڕێکانی چی دەکەن و چۆن یاری دەکەن، هەر منداڵە و بە جۆرێکی تایبەتی یاری بۆ خۆی دەکات بەبێ ئەوەی گوێ بداتە ئەوانی تر، ئەگەر پرسیار لە منداڵێک بکەیت، لە یارییەکەدا کێ بردیەوە، لەوانیە بڵێت: من و دواییش ئەو چونکە هەڵماتێکی ئەم بەر هەڵماتێکی ئەو کەوتووەو ڕاستیش دەکات، شادمانی منداڵ لەم کاتەدا، کە هەڵماتەکەی بەر هەڵماتی هاوڕێکەی دەکەوێت سنووری نییە، ئەمان یاری بۆ ئەوە ناکەن بەیەکەوە یاری بکەن، بۆئەوە یاری دەکەن شتێک ڕووبدات. منداڵ لە تەمەنی حەوتساڵیەوە بەرەوژوور، بەتەواوەتی لە دەستووری یارییەکان تێدەگات بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا بەهەموویان هەوڵدەدەین کە بەبێی ئەو دەستووره بکەن، کە دەیزانن و بەپێی ئەو دەستوورەش چاودێری یەکتر دەکەن.(کۆنترۆڵ). لێرەدا، بردنەوە و سەرکەوتن مانای ئەوەیە لەکارێکدا سەرکەوتوویت، کە یاسا و دەستووری خۆی هەیە، بەڵام دۆڕاندن زۆر گرانەو لەوانەیە منداڵ تووشی بۆڵەبۆڵ و سەر سەختی و دوورکەوتنەوە بکات لە یاری و هاوڕێکانی. لەبەرئەوە منداڵ هەوڵدەدات، کە لە پێشەوە دەستوورو یاساکانی یاریەکە باس بکات و فێریان ببێت، ئەمە خاڵێکی زۆر گرنگە کە منداڵ بتوانێ گفتوگۆ لەسەر دەستوورو یاسای یاری بکات و هەوڵبدات لەگەڵ هاوڕێکانیدا بۆ یەکتری ڕوونبکەنەوە، چونکە ئەمە یەکەم هەنگاوی(یارمەتی)ە، کە منداڵ دەینێت لەکۆمەڵدا، منداڵ ئەوە نییە، کە هەر یاری بکەن بەیەکەوە و بەس، بەڵکو بەیارمەتی دەستوورو یاسای یارییەکە، مەشقی ئاڵوگۆڕێک دەکەن کە وردە وردە توانای منداڵەکە بەهێزدەکات لەگەڵ کەسانێکی تردا کاربکەن بۆ ئامانجی دیاریکراو بە مانایەکی تر فێری بەیەکەوە کارکردن دەبن. لە تەمەنی 10 – 11 ساڵیدا منداڵ تێدەگات دەستوور و یاسا شتێکە خەڵکی دەتوانن لەنێوان خۆیاندا داینێن و دەتوانن کەی ویستیان بیگۆڕن هەتاکو ئەم کاتە دەستوورو یاسا شتێکی پیرۆز بووە، کە لەلایەن خوداوە دانراوە، یا پاشا یان گەورەکان دایانناوە و نابێت بگۆردرێن، بەڵام ئیتر لێرەوە بۆچوونی منداڵ بەرامبەر بە دەستوورو یاسا دەگۆڕێت و ئەو دەستوور و یاسایانەی خۆیان دایاندەنێن دەبن بە دەستوور و یاسای ڕاستی بۆئەوەی منداڵ بگاتە ئەم بڕوایە هەر لە حەوت ساڵییەوە پێویستی بە مەشقکردن هەیە چ لە ماڵەوە و چ لە قوتابخانە پێویستە منداڵ لەو یاسایانەی ڕۆژانە لەگەڵ هاوڕێکانی و لەگەڵ ئەندامانی خێزاندا لەسەری ڕێکدەکەون بەشداری ئاڵوگۆڕی بیری خۆی بکات. ئەگەر تەماشای ژیانی منداڵ بکەین

دەبینین چۆن لەم تەمەنەدا دەستوورو یاسا ژیانی منداڵەکە ڕێکدەخەن، خۆشترین ڕۆژی ئەو ڕۆژەیە، کە پۆڵەکەیان دیدەنی پۆلیسخانە دەکەن و دەست دەدات لە جلوبەرگ و چەک و داری پۆلیسەکانەوە. ئەمە لە پۆلی یەکەم و دووەمدا بەخۆشترین دیدەنی دەژمێردرێ بۆ منداڵ و پێویستە لەم خۆشییە بێبەشیان نەکەین. چونکە لە تەمەنی پێش قوتابخانەدا منداڵ لە یاریکردنی (دزو پۆلیس) دا خۆیان دابەش دەکەن، ئەوانەی کە وریا و بەدەستن خۆیان دەکەن بە دزو ئەوانەی، کە لاکەلا و بەستەزمانن دەکرێن بە پۆلیس، بۆ نموونە: سیپان لەتەمەنی پێنج ساڵاندا، زۆرجار لە یاریکردندا لەگەڵ ئێمە خۆی دەبێت بە پیاوە خراپەکە و منیش بە پیاوی چاک، کەچی لە تەمەنی دوای حەوتساڵیدا ڕۆڵەکە دەگۆڕدرێ و بوون بە پۆلیس لەکاتی یارییەکەدا زۆر بە نرخترەو منداڵان شەڕی لەسەر دەکەن. لە تەمەنی (9 – 12) ساڵیدا زۆر زەحمەتە تەنها بە منداڵێک لەناو هەموو منداڵانی تردا بڵێیت، کە ئەم دەبێت چی بکات یان نەیکات. بەبێ ئەوەی گوێ بداتە ئەوانی تر. لێرەدا منداڵ دەکەوێتە بیرکردنەوەو پرسیار دەکات: بۆچی دەبێت هەر ئەم ئەمە بکات و ئەوانی تر نەیکەن؟ بۆچی (ژینۆ) بۆی هەیە بچێتە دەرەوەو من بۆم نییە؟ دەبێت باسی ژیان لەگەڵ ئەم منداڵەدا بکرێت و هەموو یاسا و دەستورەکان بخرێنە قاڵبێکەوە منداڵ دەیەوێت بزانێ، کە یاساو دەستوور بۆ هەمووانە یان نا، ئەوەی کە یاساو دەستوور بەڕێوە نەبات و سەرکێشی بکات بە مانای ئەوەیە سەرکێشی لە هاوڕێکانی دەکات و پێویستی سەرشانی هاوڕێکانە کە چاری ئەم سەرکێشییە بکەن و ئەوەی لایداوە بیهێننەوە ژێر باری یاسا. سزاو دادپەروەری دوو وشەن کە منداڵ لەسەرەتای قۆناغی 7 – 12 ساڵیدا زۆر لەگەڵیان خەریک دەبێت و منداڵ لە ڕێگای سزاوە دەیەوێت بزانێ، کە دادپەروەری چییەو لەم حوکمدانەیدا زۆر دڵڕەقە و تەنها یەک ڕاست و یەک درۆ هەیە و سزا دەبێت بە قەدەر گوناهەکە بێت، چاو بە چاو دان بە دان، کاتێک منداڵێک لە دار گوێزێک دەکەوێتە خوارەوەو دەکەوێتە ناو ڕووبارێک، کە بەژێر دار گوێزەکەدا دەڕوات، هاوڕێکانی دەڵێن: خەتای خۆی بوو، بۆچی دەچێت دزی دەکات. بەهۆی سزاوە دەیانەوێت بزانن یاسا و دەستوور چییە؟ ڕەش و سپی چییە؟ بەڵام ئەگەر خۆی سزا بدرێت یاخود هاوڕێیەکی نزیکی سزا بدرێت ئەوا زۆری پێ ناخۆشە. کاتێ کە منداڵان یان گەورەکان سەرپێچی یاسا و دەستوور دەکەن و لێی لا دەدەن،

دەبێت گرنگییەکی تەواو بدرێت بەو سەرپێچی و لادانە و پێویستە باسی ئەو هەنگاوانە بکرێت کە دەبێت بنرێن بۆ دووبارەنەبوونەوەی ئەو ڕەفتارە، کاتێ کۆمەڵ یان پۆڵ ڕێککەوت لەسەرئەوەی کە لە کات و شوێنی دیاریکراودا بەیەکەوە کارێک بکەن، پێویستە هەمولایەک لە کات و شوێنی دیاریکراودا ئامادەبن و دواکەوتن لەم کارە سەرپێچییە لە یاسای کۆمەڵ و دەبێت بە دوورودرێژی لەگەڵ هەموو ئەوانەی پەیوەندییان بە مەسەلەکەوە هەیە باس بکرێت.

وشەی دادپەروەری زیاتر لە وشەی سزا دووبارە دەبێتەوە، دادپەروەری بە مانای وەکو یەک بۆ هەموو لایەک دێت، سێ هەڵووژە بۆ من و سیان بۆ تۆ، بەڵام یەکێک لە هەڵووژەکانی من بچووکترە لە هی تۆ، منداڵ پێویستە باسی هەق و ناهەق بکات و بەراوردی ئەنجامی بڕیارەکانی بکات، دەبێت کات بدرێت بە منداڵ باسی ئەمدیو و ئەودیوی مەسەلەکە بکات. لە دەوروبەری تەمەنی 12 ساڵیدا منداڵ فێری ئەوە دەبێت، کە هەق مانای ئەوە نییە هەموو شتێک دەبێت وەکو یەک بەش بکرێت و یەکسان بێت و تێدەگات کە زۆر شت کار دەکاتە سەر پێویستی جیاوازی هەق لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر. وتمان منداڵ لەم تەمەنەدا دایک و باوک دەخاتە ژێر چاودێرییەوە بۆ ئەوەی بزانێت ئەمان هەقپەرستن یان نا؟ بزانێت ئەمان برا بچووکیان زیاتر خۆش دەوێت، یان نا؟ پرسیار دەکات، دایە کێت زۆرتر خۆش دەوێت؟ دایک دەڵێت : تۆ؟ بەڵام براکەی کە لەو لاوەیەو گوێی لەم وەڵامە ناهەقە دەبێت دەپرسێت: چی؟ منت خۆش ناوێت؟ با تۆشم زۆر خۆش دەوێت. بەڵام تۆ وتت ئەوت زیاتر خۆش دەوێت؟ بەڵام من هەردووکتانم زۆر خۆش دەوێت و ناتوانم دڵی خۆم بکەم بە دوو لەتەوە، منداڵەکان تێدەگەن کە شتێک هەیە لە دەسەڵاتی دایکیاندا نییەو نابێت.

## 5- یارمەتی و بەشداربوون

هەر یەکێک لە ئێمە بەشێوەیەک لە خێزانێک، کۆمەڵێک یان پۆلێکدا بەشدارە، یاخود بڕیار دەدات کە بەشداری لە کارێکدا بکات بۆ ماوەیەکی کورت کەواتە

بەشداربوون لە کۆمەڵدا لە بچووکترین کۆمەڵەوە کە لە دوو کەس پێکهاتووە دەست پێدەکات، تا بەشداربوون لەناو گەلان و هەموو خەڵکی سەر زەوی کە.ئەمیان گەورەترین بەشداربوونە

ئەو کۆمەڵانەی کە گرنگن بۆ منداڵی 7 – 12 ساڵان ، بریتین لە خێزان ، پۆل.و گۆلمەزی هاورێکانی

کۆمەڵ چییە؟ کۆبوونەوەیەکە لە خەڵکی جیاواز. ئەمە پێناسەیەکی زۆر سادەو ئاسانە، چونکە کۆمەڵ لەوە زیاترە، کە لە کۆی چەند کەسێک پێکهاتبێت، کۆمەڵ پەیوەندییەکە. کۆمەڵ کەش و سرووتێکی تایبەتە، کۆمەڵ لەیەکتری چاوەڕوانکردنە، کۆمەڵ متمانەکردنە بەیەکتر، ئەمانە هەموویان بەیەکەوە کۆمەڵ دروست دەکەن و هەست و نەستی بەشداربوونی کۆمەڵ لەهەموو ڕوویەکەوە وەک نزیکی، بەشداری یاخود لەیەکتر دووری و ڕقەبەرایەتی هەیە بەو بارودۆخەوە کە لە کۆمەڵدا بڵاوە، لە سایەی یارمەتیدا، ئەندامانی کۆمەڵ هەست بە پشتگیری لەیەکتری دەکەن، بەڵام لە سایەی خۆپەرستیدا ئەندامەکانی کۆمەڵ هەست بە ڕقەبەرایەتی بەرانبەر بە یەکتری دەکەن. هەموو ئەندامانی کۆمەڵ بەشدارن لە دروستکردنی ئەو بارودۆخەدا کە لەناو کۆمەڵدا هەیە، جا چ لە سایەی یارمەتیدا بێت یان لە سایەی خۆپەرستیدا. لە سایەی یارمەتیدا، ئەندامانی کۆمەڵ هەوڵدەدەن گوێ لەیەکتری بگرن، (لە شوێنێکی تردا باسی گوێگرتن دەکەین). ئەندامانی کۆمەڵ هەوڵدەدەن کە خۆیان بخەنە جێی ئەندامانی تر و ئەندامانی تر قبووڵ بکەن بەبێ ئەوەی داوای لێ بکەن کە خۆیان بگۆڕن. چونکە هەر کەسە جیاوازە لەوی تر و پێویست ناکات لە یەکتری بچن. هەر.کەسێک بۆی هەیە هەڵە بکات و کەموکورتییەکانیشی قبووڵ دەکرێت

جا ئەگەر مرۆڤ هەستی بەوە کرد کە قبووڵ دەکرێت ئیتر خۆی دەکاتەوە و ئەو گرژییەی کە لە لەش و هەست و بیریدا هەیە دەرەوێتەوە، کاتێ کە مرۆڤ هەستی بەوە کرد کە دەوروبەرەکەی تێیدەگەن و یارمەتی دەدەن، ئیتر بۆ ئەویش ئاسانترە کە لە خەڵکی بگات و یارمەتی خەڵکی بدات. ئەوەی کە زۆر دیارە لە کۆمەڵێکی وادا ئەوەیە کە ئەندامەکانی دەیانەوێت زیاتر بپشکنن و بەڕاستیش بەشداری کۆمەڵەکە دەکەن، پێکەوە قسە دەکەن و هەوڵدەدەن ئەو

تەنگوچەڵەمانەی دێنە سەر ڕێگایان چارەسەریان بکەن و لەجیاتی هەست بە (خۆ)کردن، هەستێکی هاوبەش دروست دەبێت لەناویاندا.

لە سایەی خۆپەرستییدا، ئەندامەکانی کۆمەڵ ئامۆژگاری یەکتر دەکەن و دەخەنە ژێر چاودێریەوە. هەڵەو کەمتەرخەم سزا دەدرێت، ئەندامەکانی ئامادەن کە هەمیشە بەرگری لە ڕاوبۆچوونی تایبەتی خۆیان بکەن، چونکە دەزانن کە کەس نییە خۆی بۆ تێگەیشتن تەرخان بکات. لە سایەی ئەم کۆمەڵەدا زۆرجار ئەندامەکانی کۆمەڵ گۆڕەپان بەجێ دەهێڵن و خۆیان بە کاری ترەوە خەریک دەکەن یاخود دەبن بە مرۆڤی گوێنەدەر و بێهەست، یان ڕوو دەکەنە خەیاڵات و خەوی ڕۆژانە و بە کەمترین نارەحەتی هەڵدەچن و دەچن بە گژ دەوروپشتەکەیانداو یارمەتی و پێکەوە کارکردن زۆر گران دەبێت.

حیکایەتێکم بەناوی (ڕەشەبا و ڕۆژ) دێتەوە یاد، کە گرەو لەسەر ئەوە دەکەن کامیان دەتوانن پاڵتۆی بەری منداڵێک بفڕێنن، ڕەشەبا هەڵدەکات و منداڵەکەش لەسەرمانا ئەوەندەی تر خۆی دەپێچێتەوە و پاڵتۆکەی لەخۆیەوە دەئاڵێنێت. بەڵام کاتێ کە ڕۆژ دەردەکەوێت، ئیتر منداڵەکە پاڵتۆکەی لەخۆی دەکاتەوەو بەدەم گۆرانی وتنەوە دەکەوێتە ڕێ و پاڵتۆکەی لەبیر دەکات.

لە کۆمەڵێکدا کە پەیوەندی نێوان ئەندامەکانی یارمەتیدەر و گەرموگوڕە، مرۆڤ وای لێدێت کە خۆی بکاتەوە و پاڵی لێبداتەوەو بێباکانە هەرچی لە دڵ دایە بۆ ئەندامەکانی تری کۆمەڵی دەرببڕێت، بەڵام لە کۆمەڵێکی ساردو سڕو خۆپەرستدا، مرۆڤ ناچارە خۆی بخاتە ناو جلەکانیەوە و خۆی بپێچێتەوەو نەهێڵی کەس درک بە نهێنیەکانی بکات، چونکە کەس نییە گوێی لێ بگرێت و ئەویش گوێ لە کەس ناگرێت.

کاتێک کە باس لە کۆمەڵ دەکەین، زۆر ئاساییە کە باسی سەرۆک و جۆری سەرۆکی کۆمەڵیش بکەین، لەهەموو کۆمەڵێکدا جۆرێک لە سەرۆکایەتی هەیە، جاری واش هەیە کە هەندێ کەس دەبێت بە سەرۆک کە خۆی ئەم رۆڵە دەبینیت، (بڕوانە پەرتووکی منداڵەکەت بۆ وا دەکات؟).

کاتێک کە سەرۆکایەتی بە باشترین شێوەی کار دەکاتە سەر ئەندامانی کۆمەڵ، ئەم سەرۆکایەتیە نابینین، چونکە سەرۆکیش یەکێکە لە ئەندامانی کۆمەڵەکە و

بەیەکەوە هەوڵدەدەن بگەنە ئەو ئامانجانەی پێکەوە دیاریان کردووە، جا ئامانجەکان هەرچییەک بن، یارییەک بێت کە پێکەوە دەیکەن، یاخود ڕۆژێکی هەینی خۆش کە پێکەوە دەیبەنە سەر، یان شتێکی تازە کە لە پۆلدا فێری دەبن.

لەپەیوەندی نێوان ئەندامانی کۆمەڵ و سەرۆکی کۆمەڵدا هەمووکات شێوەیەک لە متمانە بەیەکتر کردن هەیە، چونکە سەرۆکایەتی هەموو مانای حوکمدارییە و ئەو حوکمدارییەش پەیوەندی بەجۆری ئەو کەسەوە هەیە کە دەسەڵاتی بە دەستەوەیە، ئەمەش بەوەوە بەندە کە ئەو کەسە تا چ پلەیەک پێویستی بەوە هەیە دەسەڵاتەکەی پێشان بدات، یا بیچەسپێنێت.

جۆرێک لە سەرۆک دەیەوێت بەشێک لە دەسەڵاتی بەسەر ئەندامانی تری کۆمەڵدا دابەش بکات، ئەمە لەشێوەی گفتوگۆی کۆمەڵەکەو چۆنیەتی باسکردنی مەسەلە گرنگەکانی نێو کۆمەڵدا دەردەکەوێت، کە چۆن سەرۆک سوورە لەسەر ئەوەی هەموو ئەندامانی کۆمەڵەکە لە بەڕێوەچوونی کارەکانی نێو کۆمەڵدا بەشداربن، چۆن پێشنیارەکان دەخاتە بەردەم، بەبێ ئەوەی هەوڵبدات کار بکاتە سەر ئەندامانی کۆمەڵ کە لایەنی پێشنیارێک بگرن یان نەگرن، چۆن سەرۆک کاتێکی تەواو تەرخان دەکات بۆ گفتوگۆ و گوێگرتن لەهەموو ئەندامانی کۆمەڵەکە، چۆن ئەندامانی کۆمەڵ دەتوانن بەسەربەستی دەنگی خۆیان بدەن بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەوەی لە قوتابخانە مامۆستاو بەڕێوەبەر بڕیار بۆ قوتابییەکان دەدەن، لە جیاتی ئەوەی بەبەشداربوونی قوتابییەکان بڕیاربدەن.

لە تەمەنی 5 – 7 ساڵاندا منداڵ پێویستی بە کەسێک هەیە لە هەندێ شوێن و کاتدا بڕیاری بۆ بدات، یاخود پلانی ژیانی ڕۆژانەی بۆ داڕێژێت، بەڵام لەگەڵ تەمەنی حەوت ساڵیدا ئیتر پێویست نییە دایک و باوک و مامۆستا ئەم دەسەڵاتە بە تەنها بەکاربهێنن و دەبێت هەوڵبدەن منداڵەکە بەشداری بڕیارەکان بکات. جا ئەو بڕیارانە لەبارەی هەرچییەکەوە بێت جاری وا هەیە هەندێ بڕیار لە کەسانێکی سەروو ئێمەوە دراوەو بڕیارەکە تەنها بە ئێمە ناگۆڕدرێت، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا دەبێت دانیشین و لێی بکۆڵینەوە و چاکەو خراپەی بڕیارەکە لەگەڵ یەکترو لەگەڵ ئەو منداڵانەدا باس بکەین کە لە بەڕێوەبردنی بڕیارەکەدا بەشدارن، چونکە ئەگەر نەشتوانین بڕیارەکە بگۆڕین دەبێت هەست و بیری خۆمان بەرانبەر بە بڕیارەکە دەربڕین و بگەینە ئەو ئەنجامەی کە بۆمان ڕوون

دەبێتەوە بۆ بڕیارەکە وا دراوە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە خۆت دەخەیتە شوێنی کەسێکی ترەوە تا لێت ڕوون بێت ئەوانەی بڕیارەکەیان داوە چۆنیان بیرکردۆتەوە. لەم تەمەنەی منداڵدا کە پێی دەوترێ: ( تەمەنی بوون بە مرۆڤێکی کۆمەڵایەتی)بەشداریی لێکۆڵینەوەو گفتوگۆی گەورەکان زۆر گرنگە.

لەم تەمەنەدا منداڵ گەورەیەکی بچکۆڵەیە و ئەگەر دایک و باوک و مامۆستا و کەسانی دەوروبەری هەموو بڕیارێکی بۆ بدەن، ئەوا وا لە منداڵەکە دەکەن لە پێشکەوتن و سەربەستی خۆی دوا بکەوێت و ببێت بە منداڵێکی سەرشۆڕ بۆ هەموو بڕیارێک یاخود ببێت بە منداڵێکی شەڕانی و هاروهاج.

ئێستا لەوانەیە کەسێک بڵێت: منداڵ پێویستی بە سنووری دیاریکراو هەیە و نابێت بڕیاری هەموو شتێک بدات، یاخود منداڵ لەکوێ لەم شتانە تێدەگات! ئەم سنووردانانە بەهۆی زۆرداریێتی دایک و باوک و گەورەکانەوە دانراوە دادەنرێت و ئەمە جیاوازە لەوەی کە سنووری دیاریکراو بۆ منداڵ دابنرێت کە چی بۆ هەیە و چی بۆ نییە، نەک تەنها ئەمە بەڵکو زۆر زیانبەخشیشە بۆ منداڵ کە گەورەکان بەرپرسیارێتی خۆیان فەرامۆش بکەن و گوێ نەدەن بەوەی منداڵ چۆن سنووری دیاریکراوی خۆی بەجێ دەهێڵێت و سەرپێچی لە سنوورە دیاریکراوەکان دەکات. چونکە منداڵ لەهەموو پشکنینێکدا بۆ دۆزینەوەی خۆی دەیەوێت بزانێت گەورەکان کێن و چەند توانایان هەیە و چەند دەزانن، ئەویش لەڕێی پێوانی خۆی بە گەورەکانەوە دەتوانێت بزانێت کە (خۆی) کێیە و چی دەتوانێت بکات.

گەورەکان دەتوانن دەسەڵاتی خۆیان بەکاربهێنن و بۆ نموونە بە منداڵ بڵێن: نابێت جگەرە بکێشێت، بەڵام هەرگیز ناتوانن ڕێگا لە منداڵ بگرن، کە بەدزیەوە جگەرە نەکێشێت، لەگەڵ ئەمەشدا دایک و باوک نابێت ڕێگای ئەوەی بدەن، کە منداڵەکە جگەرە بکێشێت، بەڵام بڕیاری جگەرە کێشان یان نەکێشان تەنها لە دەستی منداڵەکە خۆیدایە و دایک و باوک ناتوانن ئەم بڕیارەی بۆ بدەن، جا باشتر وایە کە دایک و باوک خۆیان ببن بە نموونە بۆ منداڵەکەیان لەپێشدا خۆیان واز لە جگەرە کێشان بهێنن، یاخود لەگەڵ منداڵەکەیان قسە بکەن و پێی بڵێن کە : ئەو لەوە جوانترو باشترە، کە سییەکانی خۆی بە دووکەڵی جگەرە بسووتێنێ. لەم کاتەدا هیوای دایک و باوک زۆرترە بەوەی کە منداڵەکەیان بە

گوێیان بکات، چونکە لێرەدا بڕیارەکە ئەدرێتە دەست منداڵەکە خۆی  بۆی ڕووندەبێتەوە کە ئەو مرۆڤێکەو خۆی دەتوانێت بڕیاری خۆی بدات و کەس بۆی نییە لە بری ئەو بڕیار بدات، هەموو ئەمانە پێکەوە ئەنجامێکی باشتری هەیە بۆ پێشکەوتنی مێشک و دەروونی منداڵەکە لە هەڕەشەی گەورەکان.

لە جیهانی قوتابخانەدا زۆر نموونە هەن بۆئەوەی گەورەکان بڕیار بۆ قوتابییەکان دەدەن، لەکاتێکدا کە بڕیارەکان ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە قوتابییەکانەوە هەیە و باشتر و ڕاستتر ئەوەیە، کە گەورەکان لەگەڵ قوتابییەکاندا باسیان بکەن و داوای بەشداری ئەوان لە بریارەکاندا بکەن، ئەگەرنا ژیانی قوتابخانە دەبێت بە ژیانی قسەو قسەلۆک و لە پاشملە قسەکردن و هەریەک لە مامۆستاو قوتابیان هەوڵدەدەن سنووری دەسەڵاتی خۆیان بپارێزن و قوتابخانە دەکرێت بە دوو بەشی لەگەڵ یەکتردا نەگونجاو دژ بەیەک لەوە دەردەچێت، کە شوێنی ڕەزامەندی هەموولایەک بێت و نابێتە شوێنێک بۆ پەروەردەکردنی منداڵ بۆ فێربوونی ژیانێکی دیموکراتی و دروستکردنی مرۆڤی سەربەست.

6 سەربەستی و ڕزگاربوون:

دایک و باوک زۆرجار دڵگران دەبن، کە کوڕەکەیان یان کچەکەیان کە گەورە بووە و لە تەمەنی 13- 14 ساڵاندایە، دەچێتە دەرەوە و ئەوان نازانن چی دەکات و چی ناکات. ئەوەندە دەزانن، کە منداڵەکەیان هەرچی دەکات سەرپێچییە بۆ قسەکانی ئەوان، لەوە دەترسن منداڵەکەیان لەگەڵ کەسانێکدا هەڵسوکەوت بکات کە تووشی خراپەی بکەن، ئەم ڕەفتارەی منداڵ، کە لە تەمەنی باڵقبووندایە پێی دەوترێ (خۆ ڕزگارکردن لە تەوقی گەورەکان) ئەم ڕەفتارە زۆر زووتر لەوەوپێش دەستی پێکردووە، لەڕاستیدا لە دەورووبەری تەمەنی حەوت ساڵاندا دەست پێدەکات و بەردەوام دەبێت لەگەڵ هەموو ژیانی گەنجایەتیدا، بەڵام ئەوەی جیاوازە ئەوەیە، منداڵ لەم تەمەنەدا دەتوانێت بەهۆی هێزی بازوو و مێشکیەوە بەرامبەر بە گەورەکان ڕاوەستێ و وەڵامی پرسیارەکانیان بداتەوەو ناڕەزایی خۆی دەربڕێ. لەم کاتەدا دەبێت گەورەکان سەری خۆیان بەوەوە نەیەشێنن، کە منداڵەکانیان شەڕ دەکەن و هاوڕێی خراپ هەڵدەبژێرن، چونکە هەڵبژاردن

یەکێکە لەو کارە سەربەستانەی، کە مرۆڤ دەیکات و بە تەنها خۆی لە کارکردن یان نەکردنی بەرپرسیارە، جا ئەگەر منداڵ لەوەوپێش ئامادەکرابێت بۆ ئەم هەڵبژاردنە، ئیتر نە پێویست بە ترس دەکات و نە بە شەونخوونیی دایک و باوک.

وەکو وتمان مەشقکردن بۆ بوون بە مرۆڤی ئازاد و سەربەست کارێکە هەر لە تەمەنی سێ ساڵییەوە دەست پێدەکات و منداڵ هەر لەسەرەتای ئەم قۆناغەوە خۆی هەوڵی بۆ دەدات. جا باوکایەتی و دایکایەتی لەم تەمەنەدا زۆر زەحمەتترە وەک لە قۆناغی باڵقبوون.

لەم تەمەنەدا منداڵ هەوڵی خۆ ڕزگارکردن دەدات لە تەوقی خێزان و زۆرجار دەیەوێت بە تەنها سەری خۆی هەڵگرێ و بڕوات و لە شوێنێکی تر بژی کە زۆر باشترە، لەبەرئەوە زۆرجار لە ماڵەوە کارەسات دروست دەکات و بیانوو دەگرێت، جا لێرەدا ڕۆڵی گەورەکان دێتە پێشەوە، یان ئەوەتا گوێ لە منداڵەکەیان دەگرن و ڕێگای دەدەن، کە هەست و نەستی خۆی دەربڕێ بەبێ ئەوەی هەڕەشەی لێ بکرێ و سزای بدرێت. ئەمەش دەبێت بەهۆی ئەوەی، کە لە خۆشەویستی ئەوان تێ بگات و هەست بەوە بکات ناتوانێت بەتەنها بژی و بەهەرشێوەیەک بێت بیانووی ئەوە دەهێنێتەوە کە گەورەکان بەجێ نەهێڵێت و لە ماڵەوە دەمێنێتەوە. یاخود سزای منداڵەکە دەدەن و بۆ هەموو ژیانی داخی دەکەن، چونکە ئەمە یەکێکە لەو ڕێگایانەی منداڵ دەیگرێتەبەر بۆ تاقیکردنەوەی گەورەکان و دەستکەوتنی وەڵام بۆ ئەم پرسیارانەی، کە لە مێشکدا هەن. ئەگەر پیاو چاوی خۆی دانەخا و بە وریاییەوە سەیری شەڕو ئاژاوەی منداڵ بکات، دەبینێت کە ئەم ڕەفتارە بریتییە لە دوو شت:

یەکەم: منداڵ دەیەوێت خۆی ڕزگار بکات و داوای سەربەستی دەکات.

دووەم: هەتاکو ئێستاش دەترسێت و پێویستی بە یارمەتی و کۆمەک هەیە.

ئەم دوو پێویستیە، کە دژی یەکن، بە ئاشکرا لەم تەمەنەدا دەردەکەون و هیچ کاتێک منداڵ ئەوەندە ئەم قۆناغەی تەمەنی ترسنۆک نییە، تەنانەت دەتوانین بڵێین منداڵ لە سێبەری خۆشی دەترسێت.

وەکو مرۆڤێک پێویستمان بەوەیە کە بوێرین لێپرسراوی ژیانی خۆمان بین، پێویستمان بەوەیە لێپرسراوی هێنانەدی ئامانجەکانمان بین، پێویستمان بەوەیە تێ بگەین چی باش و چی خراپە بۆمان. پێویستمان بەوەیە لەنێوان باش و خراپدا هەڵبژێرین و لە خراپەکانی دوور بکەوینەوە. ئەمەیە پێشکەوتن ئەم پێشکەوتنە لەهەموو ژیانی مرۆڤدا بەردەوامە، وەستان لە پێشکەوتن لە ڕاستیدا مانای دواکەوتنە. ئەمە مانای ئەوەیە هەمیشە دەبێت هەوڵی بەرەوپێشچوون بدەین، کە ئەم کارەش دوایی نایەت. زاخاوی مێشکی خۆمان بدەینەوە بە زانستی تازە و بەبیری تازەو جیاواز بۆئەوەی بتوانین هەستەکانمان دەربرین. ئەمە مانای ئەوەیە هەمیشە پێویستمان بەوە هەیە، کە لەگەڵ خۆمان و سەربەستی خۆمان کار بکەین و ئەمەش کارێکی سەختە و پێویستی بە کارکردنی بێسنوور و لە خۆبووردن هەیە و زۆرجار هێندە گرانە، کە دەمانەوێت وازی لێ بهێنین و هۆی سەیرو لەبار دەدۆزینەوەی بۆئەوەی بیانوو بۆ ئەو وازلێهێنانە بدۆزینەوە. لەڕاستیدا مرۆڤ لە دۆزینەوەی ئەم بیانووانەدا کارامەیە و زۆربەی کات وا دەبێت کە پیاو خەتای ژن دەگرێت و ژن خەتای پیاو و منداڵ خەتای باوک و باوک خەتای باری ئابووری و تەندروستی خۆی و نەبوونی کەرەسە و مامۆستا خەتای کات و بەرنامەی قوتابخانەو دواکەوتووی قوتابیان دەگرێت.

لە کۆمەڵێکدا کە هەوڵوتەقەلای منداڵ بۆ سەربەخۆیی دەستی بەسەردا بگیرێت. منداڵی لاتەریکبوو دروست دەبێت، کەسێک هەبێت لەسەرم بکاتەوە، شەڕم بۆ بکات، قسەم بۆ بکات، خواردنم بۆ ئامادە بکات و جلم بکاتە بەر و تەنگوچەلەمەکانم بۆ چارەسەر بکات، بۆ هیچ بکەم؟ ئایا خۆش نییە، کە هەموو شتێکم بۆ ئامادەکرابێت؟ بەڵام ئەی دوایی چی ڕوو دەدات؟ چی لە منداڵەکە دێت کاتێک کە شتێکی بۆ جێبەجێ ناکرێت؟ ئایا دەتوانێ پارێزگاری لە خۆی بکات؟ دەتوانێت لەناو کۆمەڵدا قسەی خۆی بەرێتە سەر؟ دەتوانێ بەرەنگاری تەنگوچەڵەمەکانی ژیان بێتەوە؟ بێگومان ئەمانە لەهەمووماندا ئاشکراو ڕوونە و کەسیشمان نییە دان بەوەدا بنێت، کە بەوجۆرە هەڵسوکەوت دەکەین، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هەموویان دەکەین و کردوومانە، قسە بۆ منداڵ دەکەین و قسەی پێ دەبرین، کە شەڕی بوو ڕادەکەین لەسەری دەکەینەوە ئەوەندە لەسەری ڕاناوەستین، کە خۆی بەپێی بیرو زانیاری خۆی لە مەسەلەکان وردببێتەوە و کارەکە چارەسەر بکات و وەڵامی خۆی بدۆزێتەوە. تێی دەگەیەنین کە 2+ 2

ئەکاتە 4 و لە پاش نەختێک پرسیاری لێ دەکەینەوە کە 2+2 دەکاتە چەند؟ ئەمە وەکو ئەوە وایە، پێی بڵێیت کە تۆ ئەوەندە گێلیت من ئەبێت بزانم تێگەیشتووی یا نا ! ئەوە دەگەیەنێت کە تۆ مرۆڤێکی سەربەست نیت و ئەوەندە بە دەسەڵات نیت، بۆیە دەبێت من خێرا بێم و لەسەرت بکەمەوە ، تۆ پێویست ناکات قسەکەت تەواو بکەیت، من ئەوەندە ئاقڵم دەزانم تۆ دەڵێیت چی.

ئایا بیرت لەوە کردۆتەوە کەچی دەبێت ئەگەر واز بێنیت منداڵەکان نەختێ لەسەر یارییەک شەڕ بکەن و تۆ خۆتیان تێ هەڵنەقورتێنی؟ ئایا یەکتری دەخۆن؟ ئایا چاوی یەکتری دەردەهێنن؟ ئەگەر زانیت ئەمانە دەکەن، ئەوا وەک پەروەردەکارێک دەبێت لە بروسکە خێراتر بیت و ڕێگایان نەدەیت ئازاری یەکتر بدەن، ئەگینا تۆ هیچ جێگایەکت لەناویاندا نییەو ئەوان خۆیان شەڕی سەربەستی و ڕزگاربوونی کەسایەتیی خۆیان دەکەن، خۆیان فێر دەکەن تەنگوچەڵەمەکانیان چارەسەربکەن، خۆیان فێر دەکەن لەگەڵ یەکتردا بژین، خۆیان فێری دەکەن لەسەر چۆنێتی چارەسەرکردنی گرفتەکانیان ڕێک بکەون و فێر دەبن بزانن چی ڕاستە و چی چەوتە، جا تۆ بۆ بە خۆ تێهەڵقورتاندن و بە چەند قسەیەک دەتەوێت ئاژاوەکە نەهێڵیت. تا ماوەیەکی زۆریش وام دەگێڕایەوە کە باوکم ئەوەندە کەساتییەکی بەهێزی هەبوو هەر کە دەهاتەوە ماڵەوە ئیتر ئەگەر لەپێش ئەوەشدا ئاژاوەیەک هەبووبێت لەنێوانماندا ئیتر بە هاتنە ژوورەوەی ئەو ئاژاوەکە چارەسەر دەبوو. تەنها هاتنی ئەو بەس بوو، بەڵام لەراستیدا تەنگوچەڵەمەکە هەر دەماو بە چارەسەر نەکراوی دەمایەوە لەناو خێزانەکەدا، ئەمە ژیانی ڕۆژانەی هەموو خێزانێکە لەژێر سایەی ڕژێمی فیوداڵیدا کاتێ کە ئاغا و بەگ دیارە. تەنگوچەڵەمە نامێنێت و خەڵکی لەبەرچاوی ئەو و لە ترسی ئەوەی نەبا تووڕە بێت، هەموو تەنگوچەڵەمەکانیان دەکەن بەژێر لێوەوەو لەوێدا کۆدەبێتەوە تا ڕۆژێ لەڕۆژان مرۆڤ لەوێ نامێنێ و هەوڵدەدات بە تەنها بژی، ئەوسا ئەوەندە ئاسان نییە، کە ژیانێکی سەربەست بژی و ناچار دەبێت لەژێر سایەی هەمان دەسەڵاتدا خۆی ببینێتەوە و بەهەمانشێوە نایەوێت هیچ لە بارەی تەنگوچەڵەمەی ماڵەوە بزانێت و بەلایەوە ئەوە گرنگ دەبێت کاتێک هاتەوە ماڵەوە ماڵەکە ئاژاوەی تێدا نەبێت. کاتێک قوتابییەک لە پۆلی شەشەمدا لە شوێنی خۆی هەڵسا بۆئەوەی بێت بۆلای مێزی

مامۆستاکەو قەڵەمەکەی دا بدات، یەکێک لە قوتابییەکان قاچی درێژکردو نەیهێشت بڕوا و ڕێگای پێگرت.

قوتابییەکە لە شوێنی خۆی ڕاوەستا و تەماشای مامۆستای کرد، بەڵام مامۆستا هیچی نەوت و خۆی لەم کارە هەڵنەقورتاند، ئیتر قوتابییەکە ڕێگای خۆی گۆڕی و بەلایەکی تردا ڕۆیشت، کە هەموو ڕووداوەکە تەواو بوو، ئینجا مامۆستا و قوتابییەکان پێکەوە دەستیان بە لێکۆڵینەوەی ڕووداوەکە کرد.

ئایا ڕاست بوو کە قوتابییەکە ڕێگای خۆی گۆڕی و بە لایەکی تردا ڕۆیشت؟

ئایا ڕاست بوو کە مامۆستا قسەی دەکرد؟

ئایا قوتابییەکە هەقی بوو ئەگەر کۆڵەمستێک بکێشێ بەو قوتابییەدا کە ڕێی لێ گرتبوو؟

بیروڕای مامۆستاکە ئەوەبوو، کە قوتابیە ڕێگرەکە بۆی نییە ئەو مافە لە قوتابییەکەی تر زەوت بکات، و مامۆستاکەش بۆی نییە ئەو مافەی کە دەڵێت مرۆڤ بۆی هەیە بەرگری لە مافی خۆی بکات و لە قوتابییە ڕێلێگیراوەکە زەوت بکات، واتە ڕاست نەدەبوو ئەگەر لە بری قوتابییەکە خۆی، مامۆستاکە لەسەر مافەکەی ئەو بهاتایەتە دەنگ، چونکە ئەمە لە نرخی قوتابییەکەی دەهێنایە خوارەوە، هەروەها بە خۆتێهەڵقورتاندنی لە کارەکە وای پێشانی قوتابیە ڕێگرەکە دەدا کە ئەو (هار) ەو ئەویش هەر ئەوەی دەوێت کە دان بەوەدا بنرێت کە ئەو هارەو هاریش بە مانای (ئازاو شەڕانی و بەهێز)دێت. بەڵام بە دەست نەخستنە ناو کارەکەوە قوتابییە ڕێگرەکە تێگەیشت کە کارەکەی ناڕەوایە و ئەوەندەش ناڕەوایە کە پێویست بەوە ناکات پێی بوترێت، لەکاتی گفتوگۆکەدا وردە وردە ڕووی قوتابییە ڕێلێگیراوەکە گەشایەوە و ڕوومەتەکانی سوور هەڵگەران و دیاربوو نەختێ هەستی بە سەربەخۆیی خۆی کردبوو و بڕیاری دابوو کە جارێکی تر ئەگەر کارێکی وا ڕووی دا زووتر فریای خۆی بکەوێت و وا دیاربوو هەستی بەوە کردبوو کە لە کردەوەکانیدا سەربەستە.

قوتابییە ڕێگرەکەش هەستی بەوە کردبوو کە کارەکەی سوودی نەبووە و بەلای باشدا سەرنجی هیچ کەسێکی ڕانەکێشا بوو و ئەگەر ئەم کارەی نەکردایە ئەوا

ئەم هەموو قسەکردنە لە پۆلدا پێویست نەئەبوو، لە کاتێدا کە هیچ بەڵگەیەکیشی بەدەستەوە نەبوو بۆ ئەوەی پارێزگاری لە خۆی بکات.

ئەوەی ڕێگا دەدات بە هاروهاجییەکە تا لەسەر کارە ناڕەواکانی خۆی بەردەوام بێت کۆمەڵە، کۆمەڵە بۆی دەسەڵمێنێ کە بەڕاستی ئەم هارە. باشترین ڕێگا بۆ چارەسەکردنی ئەم کارە ناڕەوایانە ئەوەیە، کە هەر لە شوێنی خۆیدا بێدەنگ بکرێت و گرنگییەکی زیاد لە پێویستی پێ نەدرێت، هەروەها دەورووپشت زەرەرێکی زۆر لەو کەسانە دەدەن کە بەرگری لە خۆیان ناکەن بەوەی کە باسیان بکات بە (ئاقڵ و شەرنەکەر) (باش بەخێوکراو) و لەسەریان دەکەنەوە، ئەمە یارمەتییەکی خراپە، کاتێک کە ئەم (ئاقڵە) گەورە دەبێت ئیتر هیچ پەیوەندییەکی بەسەربەخۆیی خۆیەوە نەماوەو زۆرجار لە چارەسەکردنی تەنگوچەڵەمەکانی ژیانیدا خۆی بە کەسانی ترەوە دەبەستێ و ئەم مافە دەداتە دەست ئەوان کە مەسەلەکەی بۆ چارەسەربکەن.

ئاقڵ و ژیر) وشەیەکە پەسنی کەسێکی پێدەکرێت و جوانترین وشەیە کە لە ) کەسێک دەنرێت، بەڵام زۆرجار لەشوێنی خۆیدا بەکار ناهێنرێت و کاتێک بەکاردەهێنرێت کە منداڵ واز لە مافێکی خۆی دێنێ و لە جیاتی (نەء) دەڵێت: (ئا)یاخود بە پێچەوانەوە.

ئاقڵ ئەوەیە، کە بەرپرسیاری ڕەفتارەکانی خۆی بێت، کاتێک کە پێویستییەکانی بۆ جێبەجێ ناکرێت و نیازەکانی سەرناگرن خەتای کەسی تر نەگرێ، ئاقڵ ئەوەیە کە وتی : ئا مەبەستی (ئا) بێت و کە وتی : نەخێر مەبەستی (نەخێر) بێت، نەک لەبەرخاتری کەسێکی تر و بۆ ڕازیکردنی دڵی کەسێکی تر ئەوە بڵێت یان بکات کە نایەوێت بیڵێت یان بیکات.

ئاقڵ ئەوەیە کە پاسەوانی مافەکانی خۆی بێت و دەستبەرداریان نەبێت.

گەڕان بەدوای سەربەخۆییدا خۆی لەخۆیدا ئامانجێک نییە، ئەم گۆڕانە وەکو وتمان لەهەموو قۆناغەکانی ژیانماندا لەگەڵماندایە و هەمووکات بەرەو ئامانجێکی تازە دەڕوات، ئەمە مانای ئەوەیە کە گۆڕان ڕوو دەدات و گەیشتن بە ئامانجەکە مانای گۆڕانە. گۆڕانیش مانای ئەوەیە ئەو ئاسایشەی لە ژیانی ئێستادا هەتە بە جێی بهێڵیت، چونکە دەتەوێت بیگۆڕی بۆ باشتر، ئەمە مانای ئەوەیە کە

ترسناکی و خەتەریات دێتە ڕێگات و لەم رێگا تازەیەدا تووشی شەونخونی و زەحمەت دەبێت، جا ئەگەر بەرگەی ئەم ژیانە پڕ لە گۆڕانانە بگریت، ئەوا دەتوانێت بەرگەی ژیانیش بگریت و بەرەوپێشی بەریت.

دیالۆگ -7

چۆن ئەم بیرە دوو سەرییە بهێنینە دی؟ چۆن قسەکردن، ئەو ڕێزگرتنە دوو سەرییە، بڕیاردان و یارمەتیدان دوا شێوەی خۆی وەربگرێ؟ چۆن دەگەین بە بڕیارێک کە هەموو لایەک ڕازی بکات؟ چۆن کەسێک هەم لەبەرچاوی خۆی گرنگ دەبێت و هەم لە پێش چاوی خەڵکی تریش؟ چۆن لە هەستی ئەو منداڵانە دەگەین کە ناتوانن هەست و نەستی خۆیان دەربڕن؟

کەرەسەی گەیشتن بەم ئەنجامانە بە (دیالۆگ )قسەکردن لەگەڵ کەسانی تر، ناو ئەبرێت کاتێک کەسێک گوێ لە یەکێکی تر دەگرێت و ڕێگای دەدات و کاتی خۆی بۆ تەرخان دەکات تا بتوانێت هەست و نەستی خۆی دەربڕێت کەوای لێدەکات بە هاوبەشی لەگەڵ کەسانی تردا بژی، دیالۆگێک ئەنجام دەدات، گوێگرتن هونەرێکی باڵایە و وشە دۆزینەوەش بۆ دەربرینی هەست و نەستی بە شێوەیەکی ڕاست و دروست و لەجێی خۆیدا، ئەم دوو شتە دەبن بەهۆی پێگەیشتن و کامڵبوون لە قسەکردندا و خۆیان لە دیالۆگدا دەبیننەوە.

لە دیالۆگێکی زیندوودا ناتوانین چاو لە هەست و نەست بنوقێنێن. هەست و نەست خێرا دێنە پێشەوەو خۆیان لە دەربڕینەکاندا پێشان دەدەن، کاتێک خاوەنەکەیان دەزانێت کە کەسێک هەیە گوێیان لێدەگرێت. بەشداربووانی دیالۆگ وا بیر دەکەنەوە: ئاخۆ کەسێک هەیە کە بەشداری لە خۆشی و ناخۆشیدا بکات، کەسێک هەیە کە بتوانێت جێی متمانە بێت و بتوانێت ڕازی دڵی بۆ دەربڕی، ئەگەر نەبێت ئەوکات مرۆڤ بە ناچاری دەچێتەوە نێو خۆی و تاریکایی نێو دڵی دەکات بە پەناگا و لێی نایەتە دەرەوە.

مرۆڤی ئەم سەردەمە لەبەر سەرقاڵی و لەبەرئەوەی فێرکراوە ناتوانێت بە ئاسانی هەستەکانی خۆی بۆ هەموو کەسێک دەربڕێت، زۆربەی جار لەبەر

تێنەگەیشتنی دەورووبەرەکەی ناچارە هەستەکانی خۆی بشارێتەوە و پەنهانیان بدات، ئەگەر لە کەسێک بپرسێت چۆنی؟ هەر زوو وەڵام دەداتەوە و دەڵێت: باشم، لەوانەیە واش نەبێت. هۆیەکەش ئەوەیە کە یەکەم: دەزانێت کە ئەوی تر کاتی نییە گوێی لێ بگرێت و دووەم: دڵنیاش نییە لەوەی کە ئەوی تر بەشداری هەست و نەستەکانی دەکات و ئەم نادڵنیاییەش یەکێکە لەو هەستانەی کە دەستمان لەسەردا گرتووە، هەروەک چۆن دەستمان بەسەر زۆر هەستی وەک ڕەشبینی، سەرلێشواوی بە ئامانج نەگەیشتن، خۆشی، هیوا، ئامانج و زەوق و حەزلێکردن و زۆر هەستی تردا گرتووە، جاری وا هەیە پێکەوە دا دەنیشین دەتوانین باسی ئاوو هەواو باری ئابووری و ڕامیاری و زۆر شتی تر بکەین و بەبێ ئەوەی بهێڵین لە هەستە ڕاستەقینەکانی دەروونمان نزیک ببینەوە، هەرچەندە زۆرجار هەستەکانمان وەک هەورە تریشقە لە پشتی قسەکانەوە، کاتێک لەگەڵ کەسێکدا قسەدەکەین کە لێی دڵنیا نین، دیارن و لەم کاتانەدا زمانمان تێکەڵوپێکەڵ دەبێت و ناخوازین لە هەستە ڕاستەقینەکانمان نزیک بینەوە.

لە دیالۆگدا پێویستمان بە دڵنیابوون هەیە و دڵنیابوونیش ئەوکاتە دەردەکەوێت کە دەزانین کەسێک گوێمان لێدەگرێت، یان هەوڵدەدات لێمان تێبگات و قسەکانمان شی دەکاتەوە، لەیەکتر تێگەیشتن و شیکردنەوەی قسەکانیش لە ئەنجامی گوێگرتنەوە دێن و گوێگرتن هونەرە جا بابزانین چۆن گوێ دەگرین. کاتێک گرفتێک لەنێوان دوولا ڕوو دەدات و لایەکیان دەیەوێت باس لە گرفتەکە بکات بەوەی کە بەناهەق و نارەوا حکمی بەسەردا دراوەو گلەیی لە بەختی خۆی دەکات، زۆرجار هۆی گلەییکردنەکە ئەوە نییە کە باسی دەکرێت و هۆی تر هەیە کە ئەم تووڕە بووەو دەیەوێت ئەم ناهەقیە روون بکاتەوە، با بڵێین کە منداڵەکەت تووڕە بووە لەبەرئەوەی کە نەتهێشتووە ئەمشەو لەگەڵ هاوڕێکانیدا بچێتە دەرەوە و دەڵێت : هەموو کەسێک بۆی هەیە بچێتە دەرەوە، من نەبێت. دایک یان باوک لێرەدا لەنێوان دوو وەڵامدانەوەدان، یان ئەوەیە کە هۆ بۆ ئەو گرفتە دەدۆزنەوە و دەڵێن : کە هیچ کەسێکی تر بۆی نییە بە شەو بچێتە دەرەوە و لێرەدا دیالۆگەکە دادەخرێت و ئیتر جێگای قسەکردن و لێدوان نامێنێت و ئەم ڕێگایەش کە زۆرجار بەکاردەهێنرێت لەلایەن دایک و باوک و مامۆستاوە دەبێت بەهۆی ئەوەی کە هیچ لایەک لە ڕاستی گرفتەکە نەگەن.

یان ئەوەیە کە دیالۆگ دروست دەبێت، ئەویش بەوەی هەوڵبدەن هەست و نەستی منداڵەکە بزانن و جارێکی تر پرسیاری لێ بکەن کە بۆچی وا هەست دەکات کە تەنها ئەو بۆی نییە بچێتە دەرەوە، لەوانەیە منداڵەکەت بڵێ: نەخێر هەر منم کە بۆم نییە بچمە دەرەوە، لەم وەڵامەدا دایک یان باوک دەتوانێت هەستی منداڵەکە بزانێت کە هەست بە تەنهایی دەکات و دەتوانێت لێی بپرسێت کە بۆچی ئەم هەستەی هەیە؟ لێرەدا بۆ دایک یان باوک، کە هیچ شتێکی لە هەستی خۆی نەخستۆتە سەر هەستی منداڵەکە و تەنها هەوڵی داوە لە هەستی منداڵەکە بگات، بۆی دەردەکەوێت کە شەڕکردنی منداڵەکە لەبەرئەوەیە کە دەترسێ بەبێ هاوڕێ بمێنێتەوە و هاوڕێکانی لێی زویر ببن ئەگەر ئەم لەگەڵیان نەچێتە دەرەوە، ئەمە پێی دەوترێ گوێگرگتنی ئەکتیڤ، کە زۆرجار هەر ئەم گوێگرتنە دەبێت بە چارەسەر بۆ گرفتەکە، چونکە ئەوەی منداڵەکە دەیەوێت ئەوەیە کە هەست و نەستی خۆی دەربڕێ و بزانێت کەسێک هەیە کە گوێی لێدەگرێت. جا ئیتر چۆن منداڵەکە چاری ئەم ترسەی خۆی دەکات لە هەڵبژاردنی هاوڕێدا پێویست ناکات دایک و باوک خۆیان پێوە خەریک بکەن و دەبێت واز بهێنن منداڵەکە بۆ خۆی چاری بکات و ئەو سەربەخۆییەی لێ نەسێنێتەوە و بڕوای پێ بکەن کە .توانای هەیە گرفتەکانی خۆی چارەسەربکات

گودرون سبێتز دەڵێت :" هەمووکات نیو هەنگاو خۆت لە دوای منداڵەکەتەوە ڕاگرە، ئەوەندە بێت کە بتوانێت منداڵەکەت بگریتەوە کە خەریک بوو بکەوێت، ".بەڵام هەرگیز لە پێشیەوە مەڕۆ منداڵەکە خۆی ڕێگا دەزانێت

:جۆرێکی تر لە دیالۆگ لەمجۆرەیە

ئیمڕۆ لە قوتابخانە چۆن بوویت؟ -

باش -

چیتان کرد؟ -

هیچ -

یاخود

- لە کوێ بوویت؟

- لە دەرەوە.

زۆرجار منداڵ هەستێکی تەواوی هەیە، کە ئەمە دیالۆگ نییەو لێپرسینەوەیە ، لەبەرئەوە زووزوو باسەکە ببڕێتەوەو خۆی لێ ڕزگار بکات، بەڵام خۆ ئەگەر منداڵەکە هەستی بەوە کرد کە ڕاستەو دایک و باوکی دەیانەوێت بەڕاستی بزانن چۆن ڕۆژەکەی لە قوتابخانە بەسەربردووە، ئەوا ئەویش زیاتر دڵی خۆی بۆیان دەکاتەوەو باسی ڕۆژەکەی خۆی دەکات.

زۆرجار دەبینین کە دایک و باوک زۆریان بەلاوە زەحمەتە لەگەڵ منداڵەکەی خۆیاندا دیالۆگێک دروست بکەن و بەڕاستی بکەونە قسەکردن لەگەڵیدا، کەچی لەگەڵ منداڵە هاوڕێ و خزم و دراوسێیەکاندا زۆر بە ئاسانی قسە دەکەن و گوێگرێکی باشیشن.

ئەمە زۆرجار ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە منداڵەکەی خۆت بەبەشێک لە خۆت دەزانیت و بە ئاسانی تێکەڵی دەکەیت لەگەڵ خۆتداو ئەمەش لەبەر کەم مەشقکردن لەوەی کە خۆت بە مرۆڤێکی گرنگ بزانیت و هەست و نەستیت بەشێکی گرنگ، و کەسانی تر و هەست و نەستیان بەشێکی گرنگ و جیاواز لە هەست و نەستی خۆت بزانێت، لەبەر ئەوە زۆر ئاسانە کە هەست و نەستی منداڵەکەش بە شتێکی ناگرنگ بزانیت و تێکەڵی بکەیت لەگەڵ هەست و نەستی خۆت، بەلای کەمەوە کاتێک کە خۆت قسە لەگەڵ منداڵەکەت دەکات ئیتر کەرەسەی کۆنترۆڵ ئامادەیە و پارێزگاری لە مافی منداڵەکەیت، زۆرجار لە کاتی قسەکردن لەگەڵ منداڵی خۆتدا ئەو گوێگرتنە ئەکتیڤەت لە بیر دەچێت و قسە بە منداڵەکەت دەبرێت و دەست دەکەیت بە قسەی زەرەرمەند و منداڵەکەت دەشکێنییەوە، وەکو ئەم قسانە: تۆ بێکەڵکی، جا تۆ چیت پێدەکرێ، ئادەی بزانم چی دەکەیت، کە ئەمجۆرە قسانەو قسەی تری لەم بابەتانە دەبێت بەهۆی دەرخستنی بێئومێدی و ناڕەزایی و دەربڕین و وا لە منداڵەکەت دەکات هەست بە خەتا بکات. هەستکردنیش بە خەتا بارێکی گرانە بۆ منداڵ و منداڵ هەوڵدەدات خۆی لەم هەستانە ڕزگار بکات بەوەی سزای ئەوکەسە بدات کە خۆی لە وێنەی ناڕەزایی دەربرین لە خواردن پێشان دەدات. ئەمەش سزایەکی ناخۆشە بۆ دایک

و ئیتر بۆڵەبۆڵ لەماڵەکەدا دەست پێدەکات و منداڵەکە ڕادەکاتە ژووری خۆی و دەرگاکە لەسەرخۆی دادەخات، یان ڕادەکاتە دەرەوەو ماڵ بە جێ دەهێڵێ.

گرفتی گەورە لە دەربڕینی هەست و نەستماندا، تووڕەبوونە. ئایە تووڕەبوون لە منداڵ سوودی هەیە یان نا؟ ئایا پیاو چەند لە منداڵ تووڕە بێت باشە؟ ئایا لە دوای تووڕەبوون تەنگوچەڵەمەکە چارەسەر دەکرێ؟ ئایا خەڵکی چیمان پێدەڵێن کاتێ کە تووڕە دەبین؟ چونکە تووڕەبوون مانای شەڕکردنە و شەڕیش ناشرینە و گەورەیەکە کە خۆی بە تێگەیشتووتر دەزانێت لە منداڵێک و دەسەڵاتی لەو زیاترە و منداڵەکە ئەو بە نموونەی بەرزی خۆی دادەنێ، دەبێت بۆچی نەتوانێ دەست بگرێت بەسەر ئەم هەستەی خۆیداو تووڕەبوونەکەی بخاتە ئەو لاوە و دەری نەبرێت.

منداڵ وەڵامی ڕاست و ڕەوانی بەلاوە باشترە وەک لە وەڵامی بە پێچ و پەنا بۆ ئەو پرسیارانەی کە بیریان لێدەکاتەوە و پێویستی بە وەڵامیان هەیە و داوا لە گەورەکان دەکات بۆ زانینیان. ئەم وەڵامە ڕاست و ڕەوانانە خەتی پانی ژیان بۆ منداڵەکە دیاری دەکات و ئەمیش بەهەمانشێوە هەست و نەستەکانی خۆی دەردەبڕێت.

هایم گینۆت Haim Ginott دەڵێت:

1- درەنگ و زوویی کەوتووە لەوەدا کە منداڵ ئێمە هەر تووڕە دەکات.

2- وەکو گەورەو پەروەردەکار هەقمانە تووڕە ببین بەبێ ئەوەی شەرم بکەین یاخود هەست بەسەر زەنشت بکەین.

3- بە مەرجێک تووڕەبوونمان نەبێت بەهۆی دەستدانە یەخەی منداڵ یان بمانەوێت لە کەسایەتی منداڵ کەم بکەینەوە.

ئەگەر لە هەڵسوکەوتی ڕۆژانەدا ئەمەش بکەیت، مانای ئەوەیە پێویستە بە شێوەیەک ئاگاداری بەرامبەرکەت بکەیت کە ئێستا خەریکە تووڕە ببیت، بە

مانایەکی تر ئاگاداری بەرامبەرکەت بکەیت کە تۆ خەریکی تووڕە دەبیت لەبەر هۆیەکی تایبەتی. ئەمە مانای ئەوەیە کە ئێمە خۆمان باشتر دەناسین و ئەوە نیشان دەدەین بە دەورەبەرمان کە ئێستا خەریکین تووڕِە دەبین، لەهەمانکاتدا خۆمان لە هەستی شەرمەزاری ڕزگار دەکەین و پێویستمان بەوە نییە کە شەرم بکەین کە تووڕە بووین، زۆرجار ئەم ئاگادارکردنەوەیە دەبێت هۆیەک بۆ نەهێشتنی هۆی تووڕەبوونەکە و ئەنجامی خراپی تووڕەبوونەکە، چونکە کاتێک کە دەڵێیت:
کاری وا بکەیت لێت تووڕەدەبم. بە مانایەکی تر، ئەم کارەم ئەوەندە بەلاوە ناشیرینە، ئەگەر تۆ بیکەیت ئەوا تووڕە دەبم، ئیتر ئەوانەی دەوروپشت دەزانن کە تووڕەبوونەکە بەرِێوەیە و ئەو نیشانانە دەخوێننەوە کە لە کردەوەکاندا و لە وێنەی دەموچاو و جووڵان و هەڵسوکەوتتدا دەردەکەون.

هەنگاوی دووەم ئەوەیە، کە روونی بکەیتەوە بۆچی تووڕە دەبیت.

- کە ئەبینم خواردنەکە دانراوە و کەچی نایەت نانەکەت بخۆیت، ئیتر خەریکم تووڕە دەبم.

- ئەوەندە تووڕە دەبم کە هەمووجارێ جلەکانت لەملاو لەولا فڕێ دەدەیت.

ئەمانە وەڵامی ڕاست و ڕەوانی هۆی تووڕەبوونن و زۆر جیاوازترە لەوە ئەگەر بڵێین:

- تۆ هەر وایت، هەمووجارێ خواردنەکە دادەنرێت، دەبێت دە جار بانگت بکەم.

- تۆ بێکەڵکی، تەمەڵ و تەوەزەلی کە جلەکانت ئاوا فڕێ دەدەیت.
ئەگەر مرۆڤ بەم شێوەیە پەلاماری بەرامبەرەکەی بدات و زیان لە کەسایەتی بدات زۆر زیانبەخشە و هەر چۆنێک منداڵەکانمان بیانەوێت خۆیان لەم قسانە لابدەن و هەوڵدەدەن هەقی خۆیانمان لێ بکەنەوە.

بەتایبەتی بۆ منداڵ گرانە کاتێ کە گەورەکان دەڵێن: ئیتر من چی بکەم، منی بەستەزمان منداڵەکان چی دەکەن، دەیکەن و من ناتوانم هیچ بڵێم. دەبێت هەر من

به قسەی منداڵەکان بکەم و چاوەڕوان بم، ئەوان بە قسەی من ناکەن، دەبێت هەر منی بەستەزمان و قوڕبەسەر خزمەتیان بکەم و ئەوان هیچ ناکەن.

لە ناخی دڵەوە منداڵەکە دەزانێت کە گەورەکەی خۆی ئەم ڕێگایەی هەڵبژاردووە و خۆی حەز بەوە دەکات کە خەڵکی بەزەیی پێدا بێتەوەو خۆی بە قوربانیی پێشان بدات، لەبەرئەوە زۆر بەلایەوە گرانە خۆی بە ئەو بپێوێ و بیەوێ لەو بچێت، کەس نایەوێ لە یەکێکی بەستەزمان بچێت. لەبەرئەوە منداڵەکە ناچار دەبێت دژی گەورەکەی ڕاپەڕێ و خۆی دوور بخاتەوە و تەنانەت شەرمیش دەکات. چونکە گرنگە بۆ منداڵ کە گەورەکەی ڕێز لە خۆی بگرێت و خۆی بە مرۆڤ بزانێت.

درۆ و دزی:

- دزیکردن لە درۆکردنیش ناشیرینترە.

- هاوڕێی درۆزن پیاو دەخاتە گومانەوە و ئیتر پیاو لەخۆی دڵنیا نییە.

- درۆکردن بێ ئەقڵییە. باشتر وایە باسی شتەکە بکەیت. کە من زۆرجار وا دەکەم، بەڵام جاری وا هەیە کە هەر درۆ دەکەم، بەڵام جاری وا هەیە کە هەر درۆ ئەکەم، نازانم بۆچی !؟ ئیتر وای لێدێ، بەڵام دوای ئەوە تووشی شەرمەزاری دەبم.

- پارەی تێدەچێت دزی بکەیت، بەڵام هیچی تێ ناچێ کە درۆ بکەیت.

- جارێکیان پاکەتێک نوقووڵم دزی و ئێستاش دەترسم کە هاوڕێکەم بەهەموو کەسێک بڵێت.

ئەو دەنگانە دەنگی قوتابیانی پۆلی سێیەمە لەبارەی ویژدان و دزی و درۆوە و ئەوە دەردەخات کە منداڵ ئیتر لەم تەمەنەوە جیاوازی نێوانی ڕاست و چەوت دەکات، جیاوازی لە نێوانی هەق و ناهەق دەکات، هەروەها دەری دەخات کە

پلەی جیاوازیان داناوە بۆ خراپی و ناشیرینی کارەکان بەوەی کە دەری دەخەن
.کە دزی ناشیرنترە لە درۆکردن

ئاسانترە کە بڵێیت: گاڵتەم کرد، کاتێ کە یەکێک درۆ دەکات، بەڵام -
.ئەوەندە ئاسان نییە کاتێ کە یەکێک قەڵەمی یەکێکی تری دزی بێت

لە سەرووبەندی دەستپێکردنی قوتابخانەدا منداڵ دەست دەکات بە ڕێکوپێک
.خستنی درۆ و ڕاستی و ئیتر وردە وردە خۆی فێر دەکات کە بەکاریان بهێنێ

فەیلەسوفی دەروونناسی، پێستالۆژی، وتویەتی: چاو مۆڕکردنەوەی گەورەکان
منداڵ دەکات بە درۆزن، ئەم درۆکردنەی منداڵ پەیوەندی بە گومانکردن یان
بڕواکردنی گەورەکان بە منداڵ هەیە، پەیوەندی بە بڕوای گەورەکان بە
منداڵەکان کە ڕاستگۆ یان درۆزنن هەیە، هەروەها پەیوەندی بە خەیاڵی منداڵەوە
.هەیە کە چۆن ڕاست و خەیاڵ تێکەڵ دەکات

سەیرترین سەرگوزشتەت بۆ دەگێڕێتەوە و دەیەوێت کە بڕوای پێ بکەیت.
باشتر وایە کە گوێی لێ بگرێت و هەوڵبدەیت وای لێبکەیت کە ئەوەیان
بگێڕێتەوە کە ڕاستە، چونکە تۆ هەستت بەوە کردووە کە هەندێ شت لەسەر
گوزشتەکەدا زەحمەتە بڕوای پێ بکرێت و حەز دەکەیت بە شێوەیەکی ڕاستتر
بۆت بگێڕێتەوە. لە تەمەنی نۆ ساڵیدا توانای منداڵ ئەوەندە پێشکەوتووە کە
جیاوازی نێوانی ڕاست و درۆ دەزانێت و جارجار کە درۆ دەکات ناچارە و
فێربووە. کە بیریش لەسەرئەنجامی درۆکانی دەکاتەوە، دەزانێت ئەنجامی خراپی
.هەیە

بەڵام منداڵ بۆچی درۆ دەکات! وەڵامێکی منداڵ ئەوەیە کە بۆئەوەی خۆی
بپارێزێ لە ناخۆشی و سزای گەورەکان و تووڕەبوونیان، منداڵێک وتی: باوکم
وا دەقیژێنێ بەسەرمدا کە پێویستە شت بخەمە گوێیەکانمەوە بۆئەوەی گوێم کەڕ
نەبێت: منداڵێکی تر وتی : تەماشاکردنێکی باوکم بەسە بۆ ئەوەی میز بکەم بە
خۆمدا." باری خێزان و گوڵمەز و پۆل و قوتابخانە کارێکی گەورە دەکەنە سەر
.منداڵ بۆئەوەی بوێرێ خۆی وەکو خۆی کە هەیە دەربخات

منداڵان بۆچی لەنێوانی خۆیاندا درۆ دەکەن؟ بۆئەوەی سەرنجی یەکتری ڕابکێشن. بۆئەوەی پارێزگاری هاوڕێیەتی بکەن، لە ترسی ئەوەی باری خێزان و چۆنیەتی ژیانی بۆ خەڵکی دەرنەخەن، ئیتر لە منداڵێک بپرسە کە بۆ درۆ دەکات، سەدەها هۆت بۆ دەدۆزێتەوە.

:سویدیدا، ژنێک وای نووسیبوو DN لە ڕۆژنامەی

هەرچەندە وەکو منداڵ خۆم دزیم کردبوو، چ لەماڵەوە و چ لە دوکاندا، بەڵام کاتێ کە بۆم دەرکەوت منداڵەکەم پارەی لە جزدانەکەم دەرهێناوە بەڕاستی تووڕە بووم و نەمدەزانی چی بکەم، خۆم بە تووڕە و سەرلێشێواو و بێنرخ دەهاتە بەرچاو، چونکە منداڵەکەم لە پشتەوە شتی لێ کردووم، لەهەمانکاتدا لە بیرمە کە کاتی خۆی بۆ دایکم گێڕایەوە، کە پارەم دزیوە چۆن باوەشی پێدا کردم و وتی : کە خەتای ئەوە بووە کە پارەی کەم داومەتێ بۆیە وام کردووە و دانیشتین و چەند سەعاتێک باسی ئەم ڕووداوەمان کرد. بەڵام ئێستا من خۆم ناتوانم خۆم هێواش بکەمەوە لەگەڵ منداڵەکەی خۆمدا.

بەڵام لە دواییدا توانیم خۆم هێمن بکەمەوە و دانیشتین بەبێ تووڕەبوون باسی ڕووداوەکەمان کرد و تێگەیشتم کە منداڵەکەم ئەیەوێت سەرنجم ڕابکێشێت بۆ لای خۆی و لە ڕاستیشدا ئەوە بوو لەو کاتەدا ئیشم زۆر ئەکرد و بە جارێ ئەوم لەبیر چووبووەوە. لەدوای ئەوە توانیمان ڕێک بکەوین کە زیاتر بەیەکەوە بین و بچینە دەرەوە.

زۆرجار گرفتەکە ئەوەندە گەورە دەبێت لەنێوان منداڵ و دایک و باوک یان لەگەڵ مامۆستاکانیدا کە بە ئاسانی گەورەکان سەریان لێ دەشێوێ و بیر لەوە دەکەنەوە کە بۆچی منداڵەکە وای لێ بەسەر هاتووە و لەدوارۆژدا چی لێدێ، ئەگەر بەردەوام بێت لەسەر دزیکردن، بۆیە دەست بە هەڕەشە و گوڕەشە و سزانی منداڵەکە دەکەن بۆئەوەی ئەم کارە دووبارە نەکاتەوە.

هەموو کەسێک دزی کردووە 9% کوڕان دزیان کردووە، ئەمە تەمەنێکە کە منداڵ فێری ڕاست و چەوت دەبێت، ڕێژەی کچان بۆ دزیکردن کەمترە لە

کوڕان و ئەمە لەوانەیە لەبەرئەوە بێت کە کوڕ دەیەوێت زیاتر خۆی نیشان بدات کە بەهێزە و ناترسێ و نیشانی هاوڕێکانی دەدات کە بوێرە و سڵ ناکاتەوە.

منداڵ لە ناخی دڵیەوە دەزانێت کە شتێکی خراپی کردووە، هەرچەندە نایەوێت دەری بخات کە شەرمەزارە، دزی ناوماڵ و خێزان زۆر ئاساییترە لە دزی تر.

لەوانەیە بەهۆی دزییەکە ئەوە بێت کە خێزانەکە بەلایانەوە زەحمەت بێت قسە لەگەڵ یەک بکەن و گفتوگۆ لە بارەی ڕووداوەکانی ژیانەوە بکەن لە ماڵەوە، جا بۆیە دزی منداڵەکە تەنها بە گرفتی منداڵەکە لە قەڵەم نادرێ، بەڵکو دەبێت وای سەیر بکەین کە گرفتی هەموو خێزانەکەیە.

دزی جۆرێکی قسەکردنە دەبێت تێی بگەیت، پیاو پێویستە یارمەتی ئەو کەسە بدات کە دزی کردووە، قسەی لەگەڵ بکات، گوێی لێ بگرێت و ئاڵوگۆڕی بیروڕای لەگەڵدا بکات، دانیشتنێکی تایبەتی پێویستە کە هەموو هەست و بیری ئەو کەسە لە پێش و لە کاتی دزییەکە و لەدوای دزییەکە ڕوون ببێتەوە و باسی بکرێت بەبێ ئەوەی گوناهی کارەکە بخرێتە سەری و ئەوەندەی تر باری هەست و نەستی گرانتر بکرێت و دەرگای گفتوگۆکە دابخرێت.

بەڵام لەهەموو بارو دۆخێکدا دەبێت ئەو شتەی کە دزراوە بەبێ زیاد و کەم بگەڕێنرێتەوە شوێنی خۆی و داوای لێبووردن لە خاوەنەکەی بکرێت و بۆی ڕوون بکرێتەوە کارەکە چۆن ڕوویداوە.

کاری گرنگی مامۆستا لێرەدا ئەوەیە کە ئەم جۆرە کردەوانە و زۆری تریش لە ژیانی رۆژانەی منداڵدا بە ڕۆحێکی فراوانەوە لە پۆلدا باس بکات و شەرم لەوە نەکات کە ڕاستی کارەکان باس بکات و رێگا بدات بە قوتابیان کە هەستی خۆیان دەبڕن بەبێ ئەوەی هەست بە شەرمەزاری بکەن، بابەتێکی وا دروست بکرێت کە دیالۆگێک دروست ببێت لەنێوان منداڵاندا کە خۆیان باسی ئەم کارە بۆ یەکتری بکەن و هەوڵبدەن ئەو شەرمەزارییەی لە مێشکیاندا خول دەخواتەوە، لەبەرئەوەی ڕۆژێ لەڕۆژان دزییان کردووە دەرببڕن و ئەو بەردە قورسە لەسەر سنگیان لاببەن، کە بەبێ شک زۆر منداڵ هەستی پێدەکات، هەر ئەم بەردە قورسە بووە بە هۆیەک لەو هۆیانەی، کە ڕێگرە لە پێشکەوتنی هەست و نەست و بیری منداڵەکە و گەشەکردنی.

پێشکەوتن و سەربەستبوون

هەندێ لە زانایانی دەروونناسی وایان داناوە، کە تەمەنی 6- 7 ساڵان تەمەنی خۆ ڕزگار کردنە لە دایک و باوک. لەم تەمەنەدا منداڵ پێگەیشتووە بۆئەوەی دەست بە قوتابخانە بکات و لە دایک و باوک دوور بکەوێتەوە (ڕزگار بوون لە دایک) بەڵام خۆ ڕزگارکردنی ڕاستەقینە لە تەمەنی 9 – 10 ساڵاندا ڕوو دەدات.

حەوت ساڵانێک پاڵکەوتنێکی تایبەتی هەیە لەناو ماڵدا کاتێ، کە خەریکی وێنەکێشانی یان شت نووسینە. ئەویش پاڵکەوتنە لەسەر سک لەو ژوورەی کە گەورەکانی خێزانی لێ دانیشتوون. بەو پاڵکەوتنە دەری دەخات، کە ئیتر زیاتر پشت بە خۆی دەبەستێت و کەمتر بە گەورەکان. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا منداڵان حەز دەکەن لە نزیک گەورەکانەوە بن، لەگەڵ دایکیاندا لە موبەق دانیشن یان لەگەڵ گەورەکانی خێزاندا لە دیوەخان دانیشن کاتێک، کە وانەکانی قوتابخانە ئامادە دەکەن، پێویستی منداڵ، کە نزیک بێت لە دایکەوە لە پێویستی بەشداربوونی منداڵەوە هاتووە، حەوت ساڵانێک پێویستی بە پەیوەندی هەستی هەیە لەگەڵ دایک و باوکیدا، یاخود لەگەڵ کەسانی تردا بۆئەوەی کە بەردەوام بێت لە هەڵسوکەوتیدا، ئەمەش لەبەرئەوەیە سەربەستی منداڵ لەم تەمەندا ڕەوتی تەواوی خۆی وەرنەگرتووە.

چۆن منداڵ هەستی سەربەستبوونی خۆی دەردەبڕێ!

منداڵ لەم تەمەنەدا سەربەستیی خۆی بەوە دەردەبڕێت، کە ئیتر ئەوەندە ئەو شتانە ناگێڕێتەوە، کە ڕۆژانە لە ژیانیدا ڕوو دەدەن، ئەمە لەوانەیە بەهۆی ئەوەوە بێت، کە منداڵ زیاتر شت دەبینێ و دەیکات و دەیبیستێ، کە ئیتر پێویستی بەو پەیوەندییە نییە، کە لەوەوپێش لەگەڵ دایک و باوکیدا هەیبووە.

کاتێ منداڵ خۆی دەست دەکات بە باسکردنی قوتابخانە و ڕووداوەکانی زۆر گرنگە گەورەکان ئەم هەڵە بقۆزنەوە و بەباشی گوێی لێ بگرن و بزانن تا چ

پلەیەک زەوقی لەگەڵ قوتابخانە هەیە، چونکە 6- 7 ساڵان خۆیان گوێکرێکی چاکن لە ماڵەوە، پێویستیان ئەوەندە زۆرە بە زانستی و ڕووداوی تازە کە خۆیان پێیان خۆشە، لەبەرئەوە زۆر بە ئاسانی زانستەکە فێر دەبن.

نیشانەیەکی تری سەربەستی منداڵ ئەوەیە، کە پەیوەندی تازە دروست دەکەن لە دەرەوەی خێزانەکەیاندا، بۆ زۆر دایک و باوک شتێکی تازە بۆیان دەردەکەوێت کە ئیتر هەر ئەوان تەنها نین لە ژیانی منداڵەکەیاندا، ئەم پەیوەندییە تازانە بۆ پێشکەوتنی سەربەخۆیی منداڵ زۆر پێویستن. منداڵانی هەشت ساڵان حەز دەکەن لەگەڵ گەورەکاندا بن، دەیانەوێ پیشانی گەورەکان بدەن، کە چەند قسە دەزانن و چەند بە ئاسانی هەڵەی گەورەکان دەدۆزنەوە و زۆرجار بەشێوەیەکی وەستایانە و ڕێزەوە باسی ئەو هەڵانە دەکەنەوە و دەستی بۆ ڕادەکێشن، زۆرجاریش پرسیاری وا دەکەن، کە وەڵامەکەی دەزانن و هیوادارن کە گەورەکان وەڵامەکەی نەزانن، دەیانەوێ زانیاری وەرگرن و زانیاری بدەن و هەوڵدەدەن پەیوەندییەکی یەکسان لەگەڵ دەوروپشتیان دروست بکەن بۆئەوەی زیاتر لە جیهانی گەورەکان بگەن. شتی تازە دەدۆزنەوە و تاقیکردنەوەی جۆراوجۆر دەکەن. هەمووی بە ئامانجی ئەوەی کە جیهانی خۆیان فراوان بکەن.

دەتوانین بڵێین کە منداڵی هەشت ساڵان یەکەم نوسخەی گەنجێتیە.

لە تەمەنی 9 – 12 ساڵاندا پێشکەوتن و سەربەستبوونی منداڵ شێوەی تازە وەردەگرێت، بەڵام بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم سەربەستبوونە پێویستمان بە ڕوونکردنەوەی هەندێ لایەنی پێشکەوتنی لەشولاری منداڵ هەیە. ئەوەی شایانی باسە لە بارەی لەشولاری منداڵەوە لەم تەمەنەدا لەوە دەچێت لە هەموو پێشکەوتنێکدا لە شوێنی خۆیدا بوەستێ منداڵ زیاد نەکات. منداڵی 9- 10 ساڵان لە بارەی لەشولارەوە زۆر زیاد ناکەن (جگە لەو کچانەی، کە بۆ یەکەمجار لەم تەمەنەدا سووڕی مانگانەیان)هەیە. ئەم منداڵانە بەهێزترو لەشساغتر دەبن وەک لەوە پێشدا بوون، ئەمانە برسیترین کەسن لەسەر سفرەی نانخواردن و شەڕانیترین کەسن لە گەڕەکدا، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ڕووخۆشی و دڵشادیان شتێک نییە، کە لێیان جیا بێتەوە.

لەنێوانی 9 – 11 ساڵیدا تەندروستی مرۆڤ باشترین تەندروستییە لەهەموو ژیانیدا، مردن لەم تەمەنەدا کەمترین بەشی هەیە. هیچ تەمەنێک نییە، کە وەک منداڵی ئەم تەمەنە، ڕووخۆش و دڵخۆش و هەستی کۆمەڵایەتی بەهێز بێت، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا تووڕەن، خەمناکن، دەترسن، بەڵام بە هیچ جۆرێک ئەم شتانە لە خەڵکانی دەوروپشتیان ئاشکرا ناکەن.

شێوەی دەربڕینی سەربەستی

هەرچەندە منداڵی 9 – 10 ساڵان وایە، وەکو باسمان کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆرجار نارەزایی دەردەبڕن بەرانبەر شتی بێنرخ و پروپووچ، ئەو منداڵانەی، کە زیاتر لە هاوتەمەنەکانیان لە بارەی لەشولارەوە پێشکەوتوون و لەشولارێکی زلتریان هەیە، زۆرجار گوێ نادەنە هەست و نەستی خەڵکی تر و بە کردەوەکانیان ڕقی خەڵکی دەوروپشتیان هەڵدەسێنن و شەڕانین و پارسەنگێک لە کردەوەکانیاندا نییە، بەهۆی ئەمانەوە گوێ نادەنە جلوبەرگ و شتومەکی خۆیان. هەموو شتێک لەو شوێنەدا فڕێ دەدەن کە بۆیان دەست دەدات. ئەگەر داوایان لێ بکەیت کە ژوورەکەی خۆیان پاک بکەنەوە یان شتەکانیان کۆبکەنەوە ئەوا هەمووی دەخەنە سووچێکەوە، یان پێلاو و گۆرەوی و کتێب و یاری و خاولی دەخزێنرێنە یەک شوێنەوە، ئەمە بەبێ شک نیشانەی دەربڕینی پێویستی سەربەستی منداڵەکە زۆر زوو زیاد دەکات و ئەم پێویستییە بەوە چارە دەکەن کە ئەوەی بۆیان بلوێ بیکەن.

ئەم ڕەفتارانە هەر لە ماڵەوە دەکرێن و کە چوون بۆ ماڵان و میوانداری ئەم 9 – 10 ساڵانەیە زۆرجار نیشانەی باش بەخێوکراویە و جێگای سەرسووڕمانی کەسوکاریەتی. ئەمە دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە ئەمانە دەیانەوێت بەرامبەر دەستەڵاتدارەکانی ماڵەوە ڕاوستنەوە و بەس و ئەمەش ماوەیەکی تر بەسەر دەچێت و دەگۆڕێت.

پێویستی دەربڕینی سەربەستی شێوەیەکی تری هەیە ئەویش (مۆدە) یە کە زۆرجار سەری گەورەکان دەئاوسێنێ، لەبەرئەوەی کە زۆرجار جیاوازە لەوەی

که هەیە، کە ئەمەش ئامانجی منداڵەکانە کە سەری گەورەکان لە کردەوەکانیان بسوڕمێ. چونکە زۆر گرانە چ بۆ کوڕو چ بۆ کچ کە لەگەڵ ئەو مۆدەیەدا نەڕوا کە باوە. چونکە ئەمانە ئەوەندە سەربەخۆ نین کە بتوان جیاواز بن لە هاوڕێکانیان سەیر لەوەدایە کە کوڕان زیاتر گوێ دەدەنە جۆری جلوبەرگ و خۆ گۆڕین وەک لە کچان. ئەمساڵ دەبێت پانتۆڵی دەرلینگ پان بێت و ساڵی دوایی لاجانگی درێژو ساڵی دواتریش کڵاو ئیتر هەر ساڵەو مۆدەیەکی دەێنە کایەوە.

گەورەکان پێویستە ناڕەزایی خۆیان دەربڕن و دەنگی خۆیان بەرانبەر بەم کردەوانە بەرز بکەنەوە و لە ڕاستیشدا ئەمەیە کە ئەوان دەیانەوێت. هەروەها منداڵان پێویستە، کە دوای خواستی خۆیان بکەون کاتێ کە کارەکە پێویستی بە شتی ڕووکەش و سادەوە هەیە. بەڵام کاتێ کارەکە پەیوەندی بە شتی گرنگەوە هەیە پێویستە گەورەکان دەنگی خۆیان دەربڕن، ئەمە پلەیەکی کۆمەڵایەتی دەدات بە منداڵەکە و شانازی پێوە دەکات لە نێوانی هاوڕێکانیدا کە دایک و باوک ناهێڵن کارێک بکات بەلایانەوە باش نییە. بەلای هەندێ منداڵەوە زۆر خۆشە کە کەسێک هەبێت لە ماڵەوە زۆرانبازی لەگەڵدا بکات و خۆی پێ تاقی بکاتەوە، ژیان بەمشێوەیە خۆشتر دەبێت.

هەر چۆنێک سەیری ئەم پێشکەوتنە بکەین، دەبینین هەردوولا تووشی تەنگوچەڵەمە دەبن، بەتایبەتی لە نێوانی 9 – 12 ساڵیدا. کە دایک و باوکەکە گرنگییەکی تایبەتی دەدەن بە منداڵەکە و هەوڵدەدەن منداڵەکەیان سەربەست و ئازاد بێت و هەست بە لێپرسراوی بکات لەلایەکەوە و لەلایەکی تریشەوە زۆر بە توندی دەست دەگرن بەسەر منداڵەکەدا و وەکو خۆی دەیهێڵنەوە و دەست دەگرن بەسەر هەڵسوکەوتیدا، نەک لەبەرئەوەی دەیانەوێت دەسەڵاتی خۆیانی بەسەردا بسەپێنن، بەڵکو لەبەرئەوەی یاخود بە ناوی ئەوەوە کە ئەمان تاقیکردنەوەی ژیانیان زۆرترە و دەزانن کە ژیان زۆر قورسترە لەوەی منداڵەکە تێی گەیشتووە و دەزانن کە ڕووی کزی و بێهێزیی منداڵەکە لە کوێدایە.

لەلایەکی ترەوە منداڵی 11- 12 ساڵان ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر داوای سەربەستی و ئازادی دەکات و داوا دەکات کە دایک و باوک خۆیان هەڵنەقورتێنن لە

ئیشوكارێ كە لە دەرەوەی خێزانەكە دەیكات و لەلایەكی ترەوە خۆی بە دڵنیا نازانێت و جاری وا هەیە كە زۆریش سوپاسی دایك و باوكی دەكات كە لێپرسراوی كارەكانی بن و خۆی هیچ لێپرسراییەك نەخاتە سەرشانی و تەنگوچەڵەمەكانی بۆ چارەسەر بكەن و ئەمیش پاڵی لێ بداتەوە، چونكە ئەمەیان ئاسانترە. لەبەرئەوە هەر چۆنێك بێت ئەوا هەندێ تەنگوچەڵەمەی ئەم قۆناغە هەیە و دەبێت بەرەنگاری ببنەوە و بە دڵێكی فراوانەوە گوێ بۆ یەكتری ڕابگرن، كە تەنها ڕێگایەكە لە هەڵەی گەورە دووریان دەخاتەوە و دەبێت بەهۆی ئەوەی زیاتر لە یەكتری بگەن.

یەكێك لە پێویستییە سەرەكییەكانی بەخێوكەر و پەروەردەكار ئەوەیە كە بەڕاستی یارمەتی سەربەستی منداڵ بدات و هەر كاتێك كە پەیوەندییەكی پڕ هەست و نەست پەیدا بوو لە نێوانیاندا ئەوا پەروەردەكارەكە دەبێت بە نموونەیەكی ڕاست بۆ منداڵەكە و پێویستە گەورەكان ئەم ڕۆڵە ببینن بە باشی و نموونەی چاك بن بۆ منداڵەكە.

بەشێوەیەكی گشتی دەتوانین بڵێین كە گوێدانی منداڵ بە خواست و داوای دایك و باوك، پەیوەندی بە خۆشەویستی منداڵەكەوە هەیە بۆ دایك و باوك زیاتر لەو بەڵگە و هۆیانەی كە دایك و باوك دەیهێننەوە بۆ منداڵەكە بۆئەوەی بە گوێیان بكات، منداڵەكە زیاتر گوێ دەداتە ئەو خۆشەویستییەی لەنێوانی خۆی و دایك و باوكیدا هەیە وەك لەوەی بۆچی ئەم كارە باشە یان خراپ و دەبێت بیكات یان نەیكات. لێرەدا گۆڕانێك لە تەمەنی 9- 12 ساڵیدا ڕوودەدات ئەویش ئەوەیە كە منداڵی بچووكتر لەم تەمەنە بە مانای لە تەمەنی 7- 9ساڵیدا زیاتر پشت بە دایك و باوك دەبەستن و پێویستیان پێیانە وەك لە منداڵی 9- 12 ساڵان لەبەرئەوەی لە قۆناغی یەكەمدا خەڵكی گرنگترەو لە قۆناغی دووەمدا شت گرنگترە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پێگەیشتنی (من) لە قۆناغی یەكەمدا و پێویستی منداڵەكە تا ئەم تەمەنەش بە گەورەكانی دەورووپشتی ، بەڵام كاتێ كە سەربەستی منداڵ زیاد دەكات لە قۆناغی دووەمدا ئیتر منداڵەكە زیاتر پشت بە (من)دەبەستێت و بەلایەوە گرنگە كە بۆچی شتێك بكات یان نەیكات نەك كێ وتوویەتی. منداڵ دەگاتە سەربەستی تەواو كاتێ كە (من) دەدۆزێتەوە، لە سەربەستیدا دەبێت مرۆڤ بزانێت خۆی كێیە و توانای هەبێت دەست بەسەر خۆیدا بگرێت و

هیلێکی سووری کێشا بێت بۆ خۆپاراستن لە دەستبەسەراگرتن یان دەست بە سەر خەڵکا گرتن.

سنووردانان بۆ سەربەستی........................

جیهانی منداڵ بەزوویی لە تەمەنی 7- 9 ساڵاندا فراوان دەبێت، بەڵام مێشکی منداڵ بە هەمان خێرایی پێناگات. لەبەرئەوە پێویستە سنوور بۆ کات و جۆری هەڵسوکەوتی منداڵ دابنرێت، منداڵ پێی خۆشە کە بە هەندێ (ڕۆتین) دەورە درابێت کە پێویستی بە هەمان هەڵسوکەوت هەیە کە بۆی دانراوە بەشێوەی سادەو بەپێی یاسای دیاریکراو، ئەم پەروەردەکردنە ژیانی منداڵ ئاسانتر دەکات و ئەم یاسایانە نیشانەی ئەوەیە کە دایکوباوک گوێ بە منداڵەکە ئەدەن. ئەم (سنوورە پێویستانە) هەندێجار دەبێت بەهۆی ناکۆکی لە نێوان منداڵ و کەسوکارەکەیدا، جاری وا هەیە کە دایکوباوک بە لایانەوە گرانە کە منداڵەکەیان دەڵێت: کە (هەموو منداڵەکانی تر وادەکەن هەر من نەبێت ) یاخود (ئەی بۆچی ئەوان وا دەکەن؟) ئەمە ئەگەر لە نزیکترەوە لێی ورد بینەوە ئەم وشەی (هەموو ئەوانی تر) دەبێت بە (یەکێک) یان جاری وا هەیە بە (هیچ کەسێک)، کە منداڵەکە ئەم ڕستەیە بەکاردێنێت تەنها بۆئەوەیە کە هەستی بێویژدانی بدات بە دایکوباوک و خۆی ڕزگار بکات لەو سنوورو یاسایانەی کە بۆی دانراوە، بەڵام ئەمجۆرە تەنگوچەڵەمانە لەناو خێزاندا دەتوانرێت لەڕێی گفتوگۆوە باس بکرێن. بە کورتی دەتوانین بڵێین: کە سنووری ئاشکرا و دیار بۆ منداڵ لەم تەمەنەدا پێویستە بۆ پێشکەوتنی سەربەستیی منداڵ، دەست بەسەر داگرتنێکی ژیرو ئاقڵانەی دایکوباوک یارمەتی منداڵەکە دەدات بۆ پێشکەوتنێکی هاوتەریب لەگەڵ پێشکەوتنی هەستونەستی منداڵەکە، سەربەستیی منداڵەکە پێشدەکەوێت کاتێک کە دەزانێت هەندێ سنوور و دەستوور هەیە و خۆی ڕازی بووە بەوەی پێڕەویان بکات.

دایکوباوکی توندوتیژ یاخود نەرمونیان...........

شتێکی زانراوە، کە هەندێ دایکوباوک زۆر توندو تیژن لەگەڵ منداڵەکانیاندا و هەندێکی تر زۆر نەرمونیانن، ئەو دوو جۆرەش هیچیان باش نیین بۆ منداڵەکە.

هەندێ دایکوباوک وا دەزانن، کە هەتاکو ئێستاش ئەوان چەقی سەرەکین لە ژیانی منداڵەکەیاندا وەکو جاران و بە توندی دەست بە منداڵەکەوە دەگرن و دەسەڵاتی خۆیانی بەسەردا دەسەپێنن، سەردانەواندنی منداڵ بۆ بڕیارەکانی دایکوباوک وەکو ئەو دایکوباوکانە بڕوایان وایە پێویستە بۆ ڕێزگرتن لە یاسای خێزان. دایکوباوک بە منداڵەکەی دەڵێت : " ئێستا وا دەکەیت کە من پێموتی " ئەگەر منداڵەکە دەنگی بەرز کردەوەو وتی : بۆچی ؟ گەورەکە هیچی بە دەستەوە نییە لەوە زیاتر نەبێت کە دەڵێ :" لەبەرئەوەی من دەڵێم!" ئەمە ڕق و کینە لەلای منداڵەکە دروست دەکات و ئەگەر نەشتوانێ دەریببڕێ ئەوا هەڵی دەگرێ بۆ دواڕۆژ. لە جیاتی ئەمە دەتوانرا بە شێوەی قسە لەگەڵ منداڵەکەدا ڕێک بکەوتایە و بۆ منداڵەکە ڕوون بکردایەتەوە بۆچی ئەم دایکوباوکە وا بیر دەکەنەوە، ئەوەی ئەم دایکوباوکانە پێویستیانە هەستێکی گەرم و شیکردنەوەی ئەو هۆیانەی کە دەیانەوێت بە منداڵەکەی بگەیەنن لە سنووری ڕێگای دیارکراودا بە مانایەکی تر پێویستە لەسەر دایکو باوک بۆ منداڵەکە ڕوونبکەنەوە کە بۆچی بۆی هەیە ئەو کارە بکات یان نەیکات، چونکە منداڵەکە پێویستی بە ڕێکوپێکی هەیە لە ژیانیدا و دەیەوێت هەموو شتێک بخاتە خانەی تایبەتیەوە ، پێویستی بە بڕیاری ڕاست و ڕەوان هەیە. تەنها ئەوەی کە لەمنداڵیدا فێر کرابێت ڕێزی داوا و خواستی کەسانی دەوروپشتی بگرێت دەتوانێت لەدواڕۆژدا بەبێ تەنگوچەڵەمە ڕێزی کەسانی دەوروبەر بگرێت

دایکوباوکێک کە ڕێگا دەدەن منداڵەکەیان خۆی بڕیاری بێسنووری خۆی بدات ئەوە بەلای منداڵەکەوە ڕێزی نامێنێ و منداڵەکە هەوڵدەدات کە ئەوەندەی تر خۆی دوور بخاتەوەو خۆی بە منداڵی ئەوان نەزانێت و شەرم بکات لەوەی کە دان بەوەدا بنێ کە ئەمانە دایکوباوکین، چونکە وا تێدەگات کە دایکوباوکی گوێی نادەنێ و ئەمیش پێویستی بە یارمەتی دایکوباوک هەیە بۆئەوەی پێشبکەوێت و ببێت بە مرۆڤێکی سەربەست. منداڵێکی هەشت ساڵان کە زۆر شەڕی لەگەڵ دایکی دەکرد بەشەو بچێتە دەرەوە و دایکیشی ڕێگای نەدەدا، شەوێکیان لە پەنجەرەکەی ماڵی خۆیانەوە چاوی بە هاوڕێیەکی کەوت کە لە دەرەوە یاری دەکرد، ئیتر بانگی دایکی کرد و وتی :" دایە دایە سەیرکە ئاسۆ بۆی هەیە لە دەرەوە بێ، چونکە کەس نییە گوێی بداتێ

هەڵسوکەوتی منداڵ دەگۆڕێ

لەم تەمەنەدا منداڵ قسە زلەکانی پێشووی بەجێ دەهێڵێت و دەگەڕێتەوە بۆ سادەیی و بەکارهێنانی وشەی گشتی و ڕۆژانە، وەک پشوو گوێ ناداتە جلوبەرگ و داخستنی قەیتانی پێڵاوەکانی لەکاتی نانخواردندا بە دەستی پیسەوە دێتەوە سەر سفرە و بەلا تییەکەوە دادەنیشێ و تاقەتی نانخواردنی نییە، یاخود دەمی پڕ دەکات لە خواردن و دەست دەکات بە قسەکردن، یاخود دەست دەکات بە شەق هاویشتن لە قاچی مێزی نانخواردنەکە و چاو دەبڕێتە شوێنێک بەبێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێت. سێ کار دەکات بە یەکەوە. دەگەڕێتەوە بۆ تەمەنی پێشوو لە بارەی شێوەی هەڵسوکەوتەوە، نیشانی دەدات کە ئیتر ئەم پشت بە دایکی و باوکی نابەستێت.

ئەم ڕەفتارە خراپانە، یاخود (ناشیرینانە) زۆرجار دڵی دایک و باوک ناخۆش دەکەن، وا دەزانن، کە منداڵەکەیان خەریکە هەموو شتێکی باش کە ئەوان فێریان کردووە لە بیری دەچێتەوە ، بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە نیشانەی پێشکەوتنی هەست و نەستی منداڵە و ئەوە نیشان دەدات، کە ئێستا دەزانێت ڕەفتاری باش و خراپ چییە و دەگەڕێتەوە بۆ سەر ڕەفتارەکانی دوایی، کاتێ خۆی و سەربەستیی خۆی دەرخست بۆ گەورەکان.ئەمە مانای ئەوە نییە کە هەموو منداڵێک لەم تەمەنەدا ئەم ڕەفتارانە دەکات و هەموو منداڵان لە یەکتری دەچن، منداڵێک کە لەگەڵ دایک و باوکێکی ڕووخۆش وەکو هاوڕێیەکی گەورەدا گەورە بووبێت، لەوانەیە کە ئەم ڕەفتارانە نیشان نەدات، کچان بەتایبەتی کەمتر ئەم ڕەفتارانە نیشان دەدەن، بەڵام ئەگەر بە وردی سەیری ڕەفتاری منداڵ بکەین دەبینین کە ڕەفتاریان لەم تەمەنەدا گۆڕاوە.

منداڵ بەهەر شێوەیەک بێت ئەم هەستەی خۆی دەردەبڕێ و ئەمە شتێکی ئاسایی و پێویستە بۆ پێشکەوتنی منداڵ ، جا باشتر وایە وەکو پەروەدەکار چاوپۆشی لە هەندێ لەو ڕەفتارانە بکەین، کە منداڵ دەیانکات، بەڵام ڕێگای نەدەین لەو دەستوور و یاسایانە لابدات کە بەلای خێزانەکەوە گرنگە، نانخواردن بە دەستی

پیسەوە نابێت و بڕایەوە، بەڵام ئەگەر نەختێ سەرپێچی لە خواردندا کردو خەیاڵ بردیەوە باشتر وایە زۆر دەنگە دەنگی لەگەڵدا نەکرێت و ئەو شتانەی وەک پەروەدەکارێک دەتەوێت پێی بڵێیت بە شێوەیەکی ئاقڵانە و لە شێوەی یارمەتیدا نەک پەنجە ڕاستکردنەوە و هەڕەشەکردندا پێی بڵێیت ، چونکە ئەو دەنگە دەنگە لەگەڵ منداڵەکەدا دەبێت بە ڕقەبەرایەتی و تابێت کارەکە خراپتر دەکات.

چی لە لەشدا ڕوودەدات؟

لە ساڵانی یەکەمی ژیاندا درێژی و کێش زۆر زوو زیاد دەکەن، دوای ئەوە دەمێ زیاد دەکەن و دەمێ پشوو دەدەن، لە تەمەنی 9- 10 ساڵانی کچاندا و لە 11- 12 ساڵانی کوڕاندا (کچان هەمووکات دوو ساڵ لەپێش کوڕانەوەن) ماوەیەکی پشوو بە خودان دێتە پێشەوە، ئەمە دواییهێنانی تەمەنی منداڵییە، ماسوولکەکان تەواو پێدەگەن و کاری بە یەکەوە کارکردنی مۆخ و ماسوولکەکان دەگاتە پلەی بەرزی خۆی. دەروونی منداڵ لە پارسەنگێکی تەواو دایە، لەبەرئەوەیە کە بەم قۆناعە دەوترێ قۆناغی شادی، لەشولار خۆی ئامادەکردووە بۆ ئەو هەنگاوە گەورەیەی کە لەبەردەمیدایە، ئەویش ژیانی گەنجێتییە.

لەم تەمەنەدا کە پێی دەوترێ (تەمەنی پێش باڵقبوون) درێژی و کێش بەیەکەوە زۆر زیاد دەکەن، بۆ کچان ئەم تەمەنە دەکەوێتە نێوانی 11- 13 ساڵی و بۆ کوڕانیش دەکەوێتە نێوان 12- 14 ساڵیەوە، لەم قۆناغەدا بەشەکانی لەش لە کاتی جیاوازدا گەورە دەبن و پێدەگەن، لەبەرئەوە دەبینین کە هەندێک لە ئەندامانی لەش بە تەواوەتی ناگونجێن لەگەڵ سەرجەمی لەشدا، لەبەرئەوە دەبینین کە زۆرجار لووت یان چەناگە لەگەڵ دەموچاودا ناگونجێت و قاچ گەورەترە لە باڵ، بە مانایەکی تر هاوئاهەنگی لە ماوەی گواستنەوەدا لەلەشدا تێک دەچێت.
لەبەرئەوە دەبینین کە زۆر منداڵ لەم تەمەنەدا تووشی زیپکە دەبن و زۆریان پێ ناخۆشە یاخود کاتێ، کە قسە دەکەن، زۆر ئارەقە دەکەن و ڕوویان سوور هەڵدەگەڕێ، لەلای هەندێ کچ مەمک و سمت لە گەورەبوون دوا دەکەوێ.

کوڕو کچ لە ماوەیەکی کەمدا خڕو خۆڵ دەبن و جاری وا هەیە کوڕیش وا دەردەکەوێت کە مەمکی هەبێت.

پێگەیشتنی سێکسی منداڵ لەم تەمەنەوە دەژمێردرێ کاتێ کە کچان خوێن دەبینن و کوڕان (شەیتانی- احتلام لیلی) دەبن. ئەمانە هەموو بەپێی شوێن و ئاوهەوا دەگۆڕێن و لەهەندێ شوێندا کچان یەکەم خوێن بینینیان لەنێوان 9 – 10 ساڵیدا و لە شوێنی تردا تا 18 ساڵی دەخایەنێت و ئەمانە هیچ کارێکی خراپ ناکەنە سەر پێشکەوتنی هەست و نەستی مرۆڤ و شتێکی کاتییە و بەسەر دەچێت. لەبەرئەوە لەم تەمەنەدا کۆمەڵ و گۆڵمەز و هاوڕێ زۆر گرنگن بۆ منداڵ و ناتوانێ خۆی جیا بکاتەوە لەوان و هەر شتێکیش لەوان نەچێت منداڵ تووشی ناخۆشی دەکات و هەست بەوە دەکات کە ئەم جیاوازە و ئیتر هەر بە جیاوازی دەمێنێتەوە بۆیە باشتر وایە کە دایک و باوک و مامۆستایان ئەم جیاوازییە گەورانە لەگەڵ منداڵاندا باس بکەن و ئامادەیان بکەن بۆئەوەی بەرەنگاری ئەم گۆڕانانە ببنەوە لە لەشی خۆیان و لەشی هاوڕێکانیاندا کە هەر یەکەیان رێگای تایبەتی خۆی دەگرێت لەم گەورە بوونەدا و هەموویان بەم تەمەن و قۆناغەدا دەڕۆن.

خۆشەویستی دەگۆڕی بۆ ڕق

هەندێ لە پشکنەرەکان دەڵێن: لەم تەمەنەدا خۆشەویستی بۆ ڕق دەگۆڕێ، نزیکی و پشت بە دایک و باوک بەستن دەگۆڕێ بە خۆ دوورخستنەوە و دژایەتیکردن بۆ دایک و باوک ئاسان نییە کە لەم گۆڕانە کوتوپڕانە بگەن و نازانن کە ئەم ڕقە لە رێزو خۆشەویستییەوە هاتووە، کە منداڵەکە خۆی لێ دەپارێزێ و خۆی لێ لادەدات. هەست و نەست دەگۆڕێ بۆ بەرامبەرەکەی ڕق پێویستە و خۆشەویستی ترسناکە و لەوانەیە مرۆڤ بگەڕێتەوە بۆ قۆناغی منداڵی.زۆر کەس جیاوازییەک لەنێوانی کوڕو کچدا دەبینن، ئەگەر کوڕەکە لە

سالانی پێشوودا توانییێتی سەربەستی خۆی لە دایکی وەرگرێ و خۆی ڕزگار کردبێ، ئەوا ئیتر پێویستی بەوە نییە، کە شەڕ بە دایکی بفرۆشێ وەکو ئەو کچانەی لەم تەمەنەدا لەگەڵ دایکیاندا دەیکەن، زۆر کچ وا دەردەکەوێ کە ڕقیان لە دایکیان دەبێتەوە لەم تەمەنەدا و ڕەخنە لە دایکیان دەگرن لە جل لەبەرکردن و قسەکردن و هەڵسوکەوتیاندا. لەم پیاچوونەوە خێرایەی ژیان، قۆناغی خۆشەویستیی دایک و باوک جارێکی تر دووبارە دەبێتەوە. نیشانەیەکی تری ئەم تەمەنەی پێش باڵقبوون ئەوەیە، کە منداڵ توانای تەرکیز کردنی کەم دەبێتەوە .بەتایەتی کاتێ کە منداڵ لە تەمەنی 14- 15 ساڵیدایە، لەم تەمەنەدا دەبینین منداڵ ڕقی لە قوتابخانە هەڵدەسێ و دەیەوێت وازی لێ بهێنێ، ئەمە کار ناکاتە سەر دوارۆژ و لەوانەیە تەمەڵترین قوتابی ئەم قۆناغە بەسەربەرێت و لە دواییدا .ببێت بە مرۆڤێکی زیرەک و پاشەڕۆژێکی باش بۆ خۆی دابین بکات

ئەم بارەی منداڵ، کە کۆنترۆڵی بەسەر خۆیدا نییە و شەڕانییە و زۆرجار ڕەخنەگرێکی زۆر بەهێزی دایک و باوکیەتی وای لێدەکات کە خۆی بە تەنها و جیاواز بزانێت لە هاوڕێکانی و وا بزانێ کە تەنها ئەمە کەس تێی ناگات و هەست بە نادڵنیایی دەکات و هەموو ئەوانی دەورووپشتی دڵنیان لە خۆیان و هیچ تەنگوچەڵەمەیەکیان نییە ئەم نەبێت. ئەم گیرو گرفتە ئەوەندەی تر قووڵ دەبێتەوە لەبەرئەوەی منداڵ لەم تەمەنەدا باسی ئەمجۆرە هەستانە بۆ کەس ناکات و لە دڵی خۆیدا دەیهێڵێتەوە، چونکە دەترسێ لەوەی کە لە نرخی کۆمەڵایەتی کەم بکاتەوە .و خەڵکی بە مرۆڤێکی بێهێزی بزانن

لەسەر گەورەکان پێویستە ڕوون و ئاشکرا هەست و نەستی خۆیان و ئەو دەستوورو یاسایانەی لەسەری دەڕۆن و بەلایانەوە پیرۆزە بۆ منداڵەکانی باس بکەن، وەکو دایک و باوک باشترە بزانێت، کە منداڵەکەت بەرەو کوێ دەڕوات پێش ئەوەی لە خۆتەوە وای لێک بدەیتەوە کە منداڵەکەت ئێستا لەو شوێنەدایە کە تۆ وات دەزانی، ئەوکاتە ئاسانترە کە قسە لەگەڵ منداڵەکەت بکەیت بەوشێوەیەی کە بیپارێزی نەک بە قسەکانتا وا دەرکەوێت کە تۆ نازانیت باسی چی دەکەیت، جاری وا هەیە دایک و باوک لەبەرئەوەی بە هەڵە لە منداڵەکەیان گەیشتوون و دەترسن لەوەی منداڵەکە وا لێ بکەن کە ئەگەر تووشی ئەو گیروگرفتەش نەبووبێت وای پیشان بدات کە تووشی بووە، چونکە دەزانێ کە ئەوان تێی ناگەن

و باشتر وایە وا بێت وەکو ئەوان وا دەزانن. منداڵێک وتی :" باشتر وایە من وابم وەکو ئەوان وا دەزانن، ئەوان تێم ناگەن و پیاو ناتوانێ قسەیان لەگەڵ بکات". زۆر ئاسانە کە پیاو بە هەڵە لە یەکتری بگات، زۆر منداڵ وا خۆی دەردەخات کە زۆر ئاڵۆزترە لەوەی کە لە ڕاستیدایە و هەوڵدەدات کە گەورەکان وا لێ بکات کە سەریان لێی بسووڕمێت.

لە ساڵانی دوایی ئەم قۆناغەدا منداڵ زیاتر لەسەر پێی خۆی دەوەستێ و مرۆڤێک دروست دەبێت کە بیرو هەست و ڕاو بۆچوونی خۆی هەیە و دەتوانێت بڕیاری خۆی بدات و بەراوردی ڕووداو و بەسەرهاتەکان بکات و خۆی ڕزگار کردووە لە تەوقی دایک و باوک لە بارەی هەست و دەروونەوە و ئێستا گرنگی دەدات بە لایەنی تری ژیان و بەشداری دەکات لە ژیانی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری گەلەکەیداو لە گۆڵمەز (دەستە)ی سپۆرت و گرنگی زیاتر دەدات بە لەشی خۆی و ئەو شتانەی کە خۆی بە پێویستیان دەزانێت بۆ ئەوەی لە دواڕۆژدا بەرەنگاری ژیان بێتەوە.

.................................منداڵ و مردن..................................

ئەگەر پرسیار لە منداڵێک بکەیت لە تەمەنی 7 – 12 ساڵیدا کە لەچی دەترسێت، لە وەڵامدا دەڵێت لە مردن دەترسێم، یاخود لەوە دەترسێت کە دایکی یان نەنکی بمرێت. لەو پشکنینانەی کراون دەرکەوتووە، بیری منداڵ لەم تەمەنەدا زۆر لەلای مردنە و نیوەی شەش ساڵیەکان دەزانن کە مردن چییە و کە خۆشیان ڕۆژێک لەڕۆژان دەبێت بمرن.

منداڵێکی حەوت ساڵان وتی: مردن وەکو ئەوە وایە  دەریایەک وشک ببێت، یەکێکی تر وتی: مردن لەوە دەچێت  بەفر بتوێتەوە یان وەکو گوڵەکان کە دەمرن مرۆڤیش دەمرێ، یەکێکی تر وتی: پیاو لە شەڕدا دەمرێ.

لەلای منداڵانی 9 – 12 ساڵان پرسیارەکان جیاوازترە و پرسیار دەکەن کە ئایا مردن چۆنە؟ دوای مردن چی ڕوو دەدات؟ منداڵ دەیەوێت باسی مردن لەگەڵ کەسێکی گەورەدا بکات. لە تەمەنی 12 ساڵیدا منداڵ تێدەگات کە هەموو کەسێک دەبێت بمرێ. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر منداڵ هەیە لەم تەمەنەدا وا دەزانێ کە هەر مرۆڤی پیر دەمرێت. منداڵێکی 12 ساڵانە وتی : کاتێ کە منداڵ بووم دەمویست بمرم بە گاڵتەوە بۆ ئەوەی بزانم مردن چۆنە. لە پشکنینێکی تردا دەرکەوتووە کە 80 % ی منداڵان لە مردن دەترسن کەچی 10 % ی دایکەکانیان وا دەزانن کە منداڵەکانیان ئەم ترسەیان هەیە.

زۆرجار گەورەکان دەیانەوێت بیر لەوە نەکەنەوە و لەبیر خۆیانی دەبەنەوە کاتێ کە منداڵەکانیان پرسیاریان لێدەکەن، چونکە وا دەزانن کە ئەمە باسێکی ئەوەندە گرنگ نییە، کە منداڵ خۆی پێوە خەریک بکات. چونکە ئێمەی گەورە ئەوەندە ئازانین کە گوێ بۆ ترسی منداڵ بگرین و زۆرجار دەڵێین کە (ئەمە هیچ نییەو خۆتی پێوە خەریک مەکە) یاخود ( کە گەورە بوویت خۆت تێدەگەیت) لە جیاتی ئەوەی کە ئەم هەڵە بقۆزینەوە و بۆ ئەو گوێگرە باشە ڕوون بکەینەوە کە مردن چییە و هەندێ لە خەم و خەفەت و ترسی کەم بکەینەوە بۆ ئەوەی ئەویش بتوانێ ئەم هەست و خەیاڵەی بە شێوەیەکی ڕاست دەربڕێ.

ڕۆژانە یان هەفتانەی منداڵ...............................

.........................

پێویست ناکات هەر لە زووەوە منداڵ فێری پارەی زۆر بکرێت، یان هەر لە خۆڕایی و لەبەر هیچ شتێک پارەی بدرێتێ یان هەر کە فلان کەس هات بۆ ماڵەوە بە میوانی ئەوە ئیتر مانای ئەوەیە پارەی پێیەو دەیدات بە منداڵەکە، ئەمە کارێکی خراپە و سەر لە منداڵ دەشوێنێ و وای لێدەکات کەوا بزانێ پارە بە ئاسانی دەستدەکەوێت، بەڵام ڕۆژانەیەکی کەم لەلایەن خێزانەوە بۆ منداڵەکە کە

خۆی بەکاری بهێنێت وەکو خۆی دەیەوێت بڕیاری بەسەردا بدات شتێکی ڕاستە، بە بۆنەی جەژنی لە دایکبوون و ڕۆژانی گرنگی ترەوە دیاری دان بە منداڵ شتێکی باشە لە سنوریکی گونجاودا.
ئەم ڕۆژانەیە(هەفتانەیە) کە بە منداڵ دەدرێ( نیشانەیەکە) و منداڵەکە فێری ئەوە دەکات کە بڕیاری بەسەردا بدات و مەشق بکات لەسەر هەڵبژاردنی ئەو شتانەی کە خۆی بە باشیان دەزانێت. ئەم ڕۆژانەیە پێویستە زیاد بکرێت بە گەورەبوونی منداڵەکە و جیاوازی هەبێت لە نێوانی منداڵانی خێزانەکەدا لە تەمەنی جیاوازدا. هەق و پێویستی سەرشان پێویستە جیاواز بێت بەپێی جیاوازی تەمەن.
کە منداڵ خۆی فێری نەخشەکێشان و پارە کۆکردنەوەو هەڵبژاردن ببێت زۆر جیاوازە لەوەی هەر دەستپان بکاتەوە و داوای پارە بکات و نەزانێ پارە چییەو نەزانێ چی هەڵدەبژێرێ.
لەبیرمە ڕۆژێکیان کاتێ کە لە دانشگای بەغدا دەمخوێند مووچەی مانگێکیان بۆ ناردم کە 25 دینار بوو، هەر هەمان ڕۆژ چووم دام بە چاکەتێک کە زۆر حەزم لێ کردبوو. (تێبینی: خوێندنم لە کۆلێژی ئابووری لە ساڵی 1970 دا بوو).
ڕۆژانەی منداڵ بەپێی باری ئابووری خێزان دەگۆڕێ و جیاوازی هەیە لە خێزانێکەوە بۆ خێزانێکی ترو ئەمە ئەگەر بێت و هەر لە ئێستاوە منداڵ بەشداری ئابووری خێزانەکە بکات و ئاگای لە بوجەدی خێزانەکە بێت هەستێکی ڕاست دەدات بە منداڵەکە و وای لێدەکات کە یارمەتی خێزانەکە بدات و هەر لە تەمەنی زووەوە هەست بەو کەموکوڕیانە بکات کە لە ناو کۆمەڵدا هەیە و بگەڕێت بەدوای هۆیەکانیدا کە ئەمەش ئەگەر چارەسەرکرا ئەبێت بەهۆی درووستبوونی کۆمەڵگایەکی یەکسانتر و بەختەوەرتر. قوتابخانە ڕۆڵێکی گەورە دەبینێت لەم بارەیەوە کە منداڵان ئامادە بکات بۆ ژیانی دواڕۆژ. قوتابخانە پێویستە ڕۆڵی کۆمەڵێکی بچووک ببینێت بۆ منداڵ کە هەموو کارو ڕووداوێکی کۆمەڵایەتی و ئابووری تێدا ڕووبدات، قوتابخانە ئەبووایە وەکو مەیدانی ماستفرۆشەکان بووایە بۆ ئەم مەبەستە و منداڵانی فێری ئاڵووگۆڕ بکردایە لەم تەمەنەدا، منداڵ فێری ئەوە بکرایە کە چۆن کارگە دادەنرێ و چۆن قازانج دەکات و چۆن خاوەنەکانی قازانجەکە بەش دەکەن، ئەمانە بە ئاسانی لە قوتابخانەدا دەکرێت و پێویستی بە کارگە و کێڵگە نییە، بەڵکو پۆل و گۆڕەپانی قوتابخانە بەسە بۆئەوەی ئەم کارەی تێدا بکرێت هەر لە درووستکردنی باخێکی

بچووکەوە لە گۆڕەپانی قوتابخانەدا تاکو ئیشی دەست و کردنەوەی بازاڕی هەفتانە و مانگانە لە ڕۆژە گرنگەکاندا کە منداڵان خۆیان شتی خۆیان دەچنن و دەیدروون و دەیکەن و بەیارمەتی مامۆستاکەیان دەتوانن ژمارە و پێوان فێربن و فێر ببن کە چۆن کارگەیەک و کێڵگەیەک درووست دەکرێت و بەڕێوە دەبرێت.

سودیکی تری هەفتانەی مندال ئەوەیە کە مندال فیری چاوەروانی ئەکات، چاوەروانی رۆژی پارەوەرگرتنەکە. ئەمەش زۆر سودی هەیە لەزۆر رووەوەی تری ژیانیشەوە،لەوانەیە  مندالەکە  بریاری کرینی ئەوەی بیری لیکردۆتەوە بیگۆریت،یان پارەکە بۆشتیکی تر بەکار بهینیت کە زۆرتر پیویستێتی.

سودیکیتری ئەم هەفتانەیە، ئەوەیە کە مندال بتوانیت پلاندانیت کە لە هەفتەی داهاتوودا چۆن پارەکەی خەرج بکات،یان نەیکات، چونکە هەندیکجار کە ئەو پیویستتیەی هەیەتی پیویستی بە پارەی زیاترە،لەبەرئەوە ئەبیت پارەکەی کۆبکاتەوە و لەگەل پارەی هەفتەی داهاتوودا ئەو شتەی خۆی خوازیاریەتی بیکریت. لیرەدا باوان ئەتوانن کە پەیمانی لەگەل ببەستن کە ئەگەر ئەو نیوەی نرخی ئەوشتەی ئەیەویت کۆبکاتەوە، ئەوە ئەوان ئەتوانن نیوەکەی تری بۆبدەن.

سودیکیتری ئەم هەفتانەیە فیربوونی ژمارەوپیوانە کە مندالەکە بەهۆی بریاردانی بۆ سەرفکردنی پارەکەی فیریئەبیت.

سودیکی تری هەفتانە، متمانە بەخۆکردن و بەرزنرخاندنی مندالەکە خۆیەتی بۆخودی خۆی. کە ئەمە ئەبیت بەهۆی بەهیزکردنی کەساییەتی مندالەکە و ریزی خۆی و کۆمەلگاکەشی بگریت.

هەموو ئەمانە و زۆرشتی تریش بەهۆی هەفتانەوە مندال فیرئەبیت.

بەلام هەرکاتیک لەخۆتەوە لەبەرئەوەی پارەت پییەودلتخۆشە دەستتکرد بەپارەپیدانی مندالەکە ئەوە هەموو ئەوشتەباشانەی کە مندالەکەت فیرییبو بەتالئەبیتەوە و وازیلیناهینیت کە ببیت بە مرۆڤیکی بەسود بۆخۆیی و بۆ کۆمەلگاکەی.

بەشی دووەم

مامۆستا

مامۆستا

مامۆستایەتی پیشەیەکی گرنگە، قوتابخانە جێگایەکی هەمیشە لە گۆڕاندایەو جێگای فێربوون و زانستە، بەڵام مامۆستایەتی بەبێ تەنگوچەڵەمە نییە، قوتابخانە زۆر تەنگوچەڵەمەی هەیە، دەبێت بەرەنگاریان ببینەوە. بۆ تێگەیشتنی ڕۆڵی مامۆستا دەبێت لەو شوێنەوە دەست پێ بکەین کە پیشەکەی تێدا دەکرێت، قوتابخانە ، قوتابخانە چ جێگایەکی هەیە لە کۆمەڵەدا و بە چ چاوێک لە کۆمەڵدا سەیری مامۆستا و قوتابخانە دەکرێت، ئامانجی قوتابخانە چییەو ڕۆڵی مامۆستا چییەو لە چ بارو دۆخێکدا کارەکەی دەکات.

تێگەیشتنی چەوت

پیشەی مامۆستایی پیشەیەکە کە زۆربەی زۆری خەڵک بە شێوەیەک پەیوەندی پێوە هەیە یاخود پەیوەندی پێوە بووە، خۆ ئەگەر وەکو قوتابی نەبێت، وەکو باوک و دایکی قوتابی و کەسانێکی تری کۆمەڵ کە کار دەکەن لەگەڵ قوتابخانەدا. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا زۆرجار خەڵکی بە هەڵە لەوەی کە مامۆستا دەبێت چی بکات و چی نەکات.مامۆستا زۆرجار تەنها و بێ کەسە لەگەڵ قوتابییەکانیدا و کەس نییە نە لە لێپرسراوان نە لە هاوڕێکانی خۆی لەو کاتەدا یارمەتی مامۆستا بدات. لێپرسراوان هەوڵدەدەن کە بەکاری بهێنن بۆ ئامانجی خۆیان و بیکەن بە بڵندگۆ بۆ پڕوپاگەندەی بیرەکانی خۆیان، یاخود بیکەن بە پاسەوانی منداڵان و نەهێڵن منداڵان لەسەر جادەکان بسووڕێنەوەو بەرەڵا بن هەتاکو کاتی سەربازی و کاریان دێت.. یاخود دایکان و باوکان لەبەر زەحمەتی ژیان و ئازار و ناخۆشی خۆیان و پەیداکردنی خۆراکی ڕۆژانە ناپرژێنە سەر ئەوەی کە ئاوڕێک لە منداڵەکانیان بدەنەوەو منداڵانیش لەبەر بێکەڵکی و نەگونجانی پرۆگرامی قوتابخانە لەگەڵ ڕاستی و پێویستی ژیاندا ئەوەندە بەلایانەوە گرنگ نییە کەچی فێر دەبن.

جا ئەمانە هەمووی باری سەرشانی مامۆستای گران کردووەو مامۆستاش هیچ شتێکی وای بە دەستەوە نییە کە دەنگی خۆی بە هۆیەوە ڕابگەیەنێ بە خەڵکی، لەگەڵ ئەوەشدا کە مامۆستا ئەو بەرپرسیاریەتیەی لێ وەرگیراوەتەوە کە خۆی بڕیاری خۆی بدات کە قوتابخانە چۆن بێت و مامۆستاش وەڵامی ئەو پرسیارانەی ئەوێ کە لە مێشکیا خوول دەخواتەوە.

چیمان لە قوتابخانە دەوێت؟

ئایا قوتابخانە شوێنی دەست بەسەر داگرتنی منداڵانە بۆ ئەوەی ئەملاو ئەولا نەکەن یان شوێنی زانست و ژیانە؟ ئایا قوتابخانە دەبێت منداڵ پەروەردە بکات یان فێری خوێندن و نووسینی بکات؟ ئایا لەسەر قوتابخانە پێویستە زانستی

ئامادەکراو بدات بە قوتابیان و ئەوانیش وەکو تووتی دووبارەی بکەنەوە یان قوتابیان ئامادە بکات بۆ چارەسەرکردنی تەنگوچەڵەمەی ژیان و ئەو بناغەیەیان بۆ دابنێ کە خۆیان لەسەری بڕۆن و بگەڕێن بەدوای ڕاستیدا بەهۆی ئەو بناغەیەی کە دەستیان کەوتووە لە قوتابخانەدا؟ یاخود کاری مامۆستا ئەوەیە کە بگەڕێ بەدوای دەستوور و یاسای تازەدا و بیخاتە بەردەمی قوتابیان بۆ ئەوەی ئەوانیش شیبکەنەوەو ڕێگای تازە بدۆزنەوە بۆ بەرەوپێشچوون و گۆڕان؟ یاخود کاری قوتابخانە ئەمانە هەموویەتی بە پلەی جیاواز و بەپێی پلەی وشیاری قوتابی.

ئەمانە هەمووی پرسیارن کە مامۆستا لە خۆی دەکات و وەڵامیان نییە، جا بۆیە بۆ وەڵامی ئەمانە پێویستە کە مامۆستایان دەنگی خۆیان بەرزکەنەوە و خۆیان ڕێک بخەن، پێویستە ئەم پرسیارانە کۆمەڵ بەشداری بکات و گفتوگۆیان لەسەر بکات. ئەگەر مامۆستا دەنگی نەبیستریَ ناشبینریَ.

مامۆستا چی پێویستە!؟

1- تازە کردنەوەی زانیاری

لەبەرئەوەی زانیاری هەردەم لە پێشکەوتن و گۆڕاندایە و مامۆستاش مرۆڤێکە کە چەکی دەستی زانستی و زانیاریە لەبەرئەوە مامۆستا پێویستی بە تازەکردنەوەی زانیارییەکەی هەیە بۆئەوەی لەگەڵ گۆڕانی کۆمەڵ و زانستدا بڕوات و هەموو زانستێک، کە خۆڵی ڕۆژگاری لەسەر لانەبەیت ون دەبێت و بەکارنامێنێ و دەبێت بەهۆی لەبیرچوونەوە و دواکەوتنی پلەی زانستی، لەبەرئەمانە مامۆستا هەمیشە پێویستی بە تازەکردنەوەی زانستییەکەی هەیە، ئەمەش بەزۆر جۆری جیاواز دەکرێت و زۆر ڕێگا هەیە بۆ گەیشتن بەم مەبەستە.

یەکێک لەم ڕێگایانە (کۆنفرانسی زانستی) یە کە لە سەرەتای هەر نیوەی - ساڵێکدا دەگیرێت و کەسانی زاناو شارەزا لەبارەی زانیاری خۆیانەوە باس دەکەن بۆ مامۆستایان، جا هەر کۆمەڵەی بە جیاو لەگەڵ شارەزای جیاوازدا بۆ ماوەی هەفتەیەک لەو باس و زانستیانە دەکۆڵنەوە کە مامۆستایان پێویستیانە بەپێی ڕێکەوتنی مامۆستایان خۆیان. بۆ نموونە: مامۆستایانی ماتماتیک لە قوتابخانەی سەرەتایی لە شارێکدا یان ناوچەیەکدا هەفتەی یەکەمی ساڵی خوێندن بۆ کۆنفرانسی زانستی لەگەڵ شارەزایانی ماتماتیکدا تەرخان دەکەن و لەو هەفتەیەدا ئاڵۆگۆڕی زانستی دەکەن و باسی جۆری وتنەوەی وانەی ماتماتیک و ئەو تەنگوچەڵەمانەی، کە دێنە بەردەمیان و ڕێگای تازەو پێشکەوتنی زانستی تازە لەم بارەیەوە دەکەن، بەهەمانشێوە مامۆستایانی زمان و مامۆستایانی جوگرافیاو مێژوو و هەموو بابەتە زانستییەکانی تر.

ڕێگایەکی تر بۆ تازەکردنەوەی زانستیی مامۆستا، دروستکردنی یانەی جیاوازی مامۆستایانە، کە بەهۆی زانستە تایبەتییەکەی خۆیان پەیوەندی بەیەکەوە دەبەستن بۆ دروستکردنی ئەم یانەیە و دەبن بە هاوڕێی کارو زانستی لەنێوانی خۆیاندا. جا پێویست ناکات ئەمانە هەموو مانگێک یان ماوەیەکی دیارکراو کۆبوونەوە بکەن، ئەوەندە هەیە بەلای کەمەوە ساڵی جارێک، شەوێک یان ڕۆژێک تەرخان بکەن کە باری وانەوتنەوە و ئاڵوگۆڕی دیتن و بۆچوونی یەکتری بکەن. یاخود کۆرس دروست بکەن لە بارەی بابەتێکی تایبەتەوە و چەند جارێک کۆببنەوە و باسی کارەکە بکەن. باشی ئەمە ئەوەیە، کە مامۆستایان بە داخوازی خۆیان ئەم گۆڵمەزە دروست دەکەن و لەبەرئەوەی ژمارەیان زۆر نییە لە 4 – 8 مامۆستا پێکدێت و لەبەرئەوەی زۆرجار لە قوتابخانەی نزیک یەکەوە هاتوون و باری ژیانیان لە یەکتری نزیکە بۆیە تەنگوچەڵەمەکانیان لە یەکتری دەچێت. لەبەرئەوە زیاتر سوود وەردەگرن.

بۆ نموونە : مامۆستایانی مێژوو دەتوانن خۆیان ڕێک بخەن لە کۆرسێکی چەند جاریدا کە چەند جارێک یەکتری دەبینن لەگەڵ یەکتریدا و باسی کتێبێکی مێژووی دەکەن کە هەموویان کتێبەکەیان لەوەوپێش خوێندبێتەوە و لەدوای ئەوە لە کۆرسەکەدا ئاڵوگۆڕی زانستی و شارەزایی بکەن.

2- مامۆستا لە کارەکەیدا پێویستی بە سەربەستی هەیە:

ئەمە مانای ئەوەیە، کە مامۆستا خۆی نەبەستێتەوە بە وردەکاری سەرەوە و سەرەوە بۆی نەبێت دەست بخاتە کاری مامۆستاوە. تەنها ئەوەی پێویستە بۆ مامۆستا (خەتی پان)ە کە بریار بدرێ لە سەرەوە ، ئیتر خۆی سەربەست بێت لەوەی کە چۆن دەگاتە ئەو ئامانجە.

بۆ نموونە : ئامانجی پەیڕەو پرۆگرامی پۆلی دووەم لە ماتماتیکدا ئەوەیە، کە منداڵان بتوانن (+-) فێر بن، ئیتر پێویست ناکات لەلای سەرەوە بۆ مامۆستا نیشان بکرێت کەچی دەکات و چۆن دەگاتە ئەم ئەنجامە. ئەمە بەجێ دەهێڵرێ بۆ مامۆستا خۆی بڕیاری لەسەربدات و سەربەست بێت لەو ڕێگایانەی کە دەیگرێتەبەر بۆ گەیشتن بەم ئامانجە. هەروەها بۆ هەموو زانستەکانی ترو بۆ هەموو پۆلەکانی تر. ئەمە وا لە مامۆستا دەکات کە زیاتر خۆی خەریک بکات بە شێوەی فێربوونی منداڵەکانەوە و هەوڵبدات کە ڕێگای جیاواز تاقی بکاتەوە و بوێرێ هەنگاوی سەربەستانە بهاوێژێ بۆ ئەم مەبەستە و بگەڕێ بە دوای سەرچاوە و پرسیارکردن لە شارەزایان و کۆکردنەوەی زانستی ، کە لە دواییدا دەبێت بەهۆی بڕواکردن بەخۆ و بەرزکردنەوەی ڕاددەی زانستی و زیاتر گرنگیدان بە کارەکەی و ببێت بە نموونەیەکی زیندوو بۆ قوتابییەکانی.

3- مامۆستا پێویستی بە ئازادی هەیە لە ڕامیاریدا:

بە مانای ئەوەی، کە مامۆستا دوور بێت لە کاری ڕامیاری پارتی تەسک و هیچ پارت و کۆمەڵێک مامۆستا بەکار نەهێنێ بۆ کاری خۆی و مامۆستاش لە قوتابخانەدا بێلایەن بێت لەو بارەیەوە. بەڵام لە دەرەوەی قوتابخانە مامۆستا دەتوانێ وەکو مرۆڤێکی سەربەست بیروڕای خۆی دەربڕێت بەبێ ئەوەی کار بکاتە سەر قوتابییەکان، لەبەرئەوەی مامۆستا نموونەیەکی زیندووە بۆ قوتابییەکان وا لە قوتابییەکانیش دەکات کە هەرچەند بیروڕای ڕامیاری جیاوازیان هەبێت بتوانن لە کاتی کاری زانستیدا بەیەکەوە کار بکەن و ئەمە کارێکی باش دەکاتە سەر ئەنجامی کارەکەیان. لەکاتی زانستدا زانست و کارکردن و لەکاتی ڕامیاریدا کاری ڕامیاری. لەکاتی یاریدا یاری و لەکاتی کاردا کار. بە مانایەکی تر بەشکردنی کاتی خۆی بۆ کاری جیاواز، کە ئەمە زۆر گرنگە و زۆرجار لەژیاندا دێتە ڕێمان.

4- مامۆستا پێویستی بەوە هەیە دانی پێدا بنرێ.

به مانایەکی تر پێویستە مامۆستا مافی هەبێت و کۆمەڵ دانی پێدا بنێت بۆئەوەی شوێنی ئاسایی خۆی لە کۆمەڵدا بگرێ. ئەمە کاری مامۆستا خۆیەتی و کەس ئەم کارەی بۆ ناکات. دەبێت مامۆستا زەحمەتی قوتابییان و خۆشی هەڵگرێت. لەڕاستیدا ئەوەندە ڕێگا زۆرە بۆ ئەم کارە بەقەدەر ژمارەی مامۆستایان خۆیان. لە کۆنفرانسێکی مامۆستایانی دارتاشی(کۆنفرنسی زانستی) کەخۆمان (مامۆستایانی دارتاش) دروستمان کردبوو باسی ئەوەمان کرد کە چۆن ئێمە وەکو مامۆستاکانی تر تەماشا ناکرێن لە قوتابخانەدا و کارەکەمان بەتەنها دەکەین و پەیوەندیمان بە مامۆستاکانی ترەوە زۆر کەمە (کاری دارتاش و درووماں و چێشتلێنان لەهەموو قوتابخانە سەرەتاییەکاندا لە ئەوروپادا هەیە) لە دوای ئەوە، کە هەموو گلەیی خۆمان دەربڕی و قسەکانمان تەواوکرد. ئەو مامۆستا شارەزایەی، کە کۆنفرانسەکەی دەگێڕا داوای لێ کردین کە نووسینێکی پیشان بدەین کە مامۆستایەک خۆی نووسیبێتی لەم بارەیەوە و باسی ئەم بارو دۆخەی تێدا کرابێت، بەڵام کەس لە مامۆستایانی دارتاش ڕۆژێک لەڕۆژان شتێکی نەنووسی بوو کە کەسێکی تر بیخوێنێتەوە و لەو بارە ناخۆشەمان تێبگات. جا ئیتر گەیشتینە ئەو ئەنجامەی، کە دەبێت ڕۆژگار نامەی خۆمان بینووسین و هەوڵبدەین، کە لە ڕۆژنامەی مامۆستایانی و شوێنی تردا بڵاوی بکەینەوە بۆئەوەی مامۆستایانی تر لە قوتابخانەدا بزانن، کە ئێمە لە چ بارێکدا دەژین و چۆن کار دەکەین. ئەگینا گلەییکردنی خۆڕایی سوودی چییە و خەڵک چۆن لە باری ئێمە تێدەگات ئەگەر ئێمە بۆی باس نەکەین. ئێمە داوامان لە خەڵکی دەکرد کە لە بارەی کارەکەمان تێبگەن کەچی خۆمان هیچمان نەدەکرد. کە دەنگیشمان نەکرد نابیسترێین.

:مامۆستا پێویستی بە پەیوەندی لەگەڵ دایکان و باوکاندا هەیە -5
بەبێ ئەم پەیوەندییە مامۆستا هەرگیز ناتوانێ پێویستییەکانی قوتابی بە ڕێکوپێکی بهێنێتە دی. ئەم پەیوەندییە دەبێت بە پردێک کە منداڵەکە بەسەریدا دەپەڕێتەوە بۆ کۆمەڵ. دایک و باوک زۆر دەزانن لەبارەی منداڵەکەیانەوە، کە لە قوتابخانە نایزانێت و قوتابخانەش زۆر شت دەزانێ لە بارەی منداڵەکەوە، کە خێزان نایزانێ. منداڵ هەمووکات وەکو یەک ڕەفتار ناکات. ئەو منداڵەی، کە گوێڕایەڵ زیت و وریایە لەماڵەوە و بەشداری هەڵسوکەوتی خێزان دەکات

مەرج نییە، کەوا بێت لە قوتابخانە و مەرجیش نییە کە باسی ئەم دوو جۆرە ژیانەی بکات بۆ کەس. ئەو منداڵەی، کە لە ماڵەوە گوێڕایەڵ نییە و کاری ڕاستی نازانێ لەوانەیە لە قوتابخانە قوتابییەکی گوێڕایەڵی زیرەک بێت، هەموو جۆرێک لەم بابەتانە هەیە و دوایی نایەت. قوتابی هەیە باش نابینێت و باش نابیستێت و کەسیش نازانێ لە چ بارێکدا ئەم منداڵە دەژی و ئەویش ناوێرێ قسە بکات. چونکە لەوانەیە هاوڕێکانی گاڵتەی پێ بکەن. منداڵی وا هەیە پێویستی بە یارمەتی تایبەتی هەیە و قوتابخانە نازانێ. ئەمانەو گەلێکی تریش، لە پەیوەندی نێوانی مامۆستا و دایک و باوکدا ڕووندەبێتەوە و دەتوانرێت زیاتر یارمەتی قوتابییەکە بدرێت. ئەم پەیوەندیی مامۆستا و دایک و باوکە دەبێت بە دروستبوونی پەیوەندییەکی باشتر لەنێوانی مامۆستا و قوتابی و دروستبوونی بارێکی لە بارو پۆزەتیڤ، کە قوتابییەکە تێیدا دەگەشێتەوە و سەرپشک دەبێت لەوەی کە یارمەتی دەدرێ لەکاتی پێویستدا. بەڵام ئایا هەموو دایک و باوکێک کاتی ئەوەی هەیە پەیوەندی بە قوتابخانە بکات؟ ئایا هەموو مامۆستایەک هەندێ لەکاتی خۆی تەرخان دەکات بۆئەوەی پەیوەندی بکات بە دایک و باوکەوە؟ ئایا کاتی ئەوەی هەیە ئەم کارە بکات؟ ئایا ئەم پەیوەندیکردنە ئەوەندە بە گرنگ دەزانرێ لەلایەن دامودەزگای پەروەردەوە کە کات و پارەی بۆ تەرخان بکات؟ یاخود ڕێگای مامۆستا بدات لەکاتی خۆی بەشێک تەرخان بکات بۆ ئەم پەیوەندییە؟ ئایا قوتابخانە ئامادەیە ڕۆژێک دابنێ بۆ پەیوەندیکردن بە دایک و باوکانەوە و میوانداریان بکات لە قوتابخانەو نەختێ دەمەتەقێ لەگەڵ دایکان و باوکان بکات.

لە وڵاتانی ئەوروپا ڕۆژێک تەرخان دەکرێ بۆ گفتوگۆ لەگەڵ دایکان و باوکان کە ئەو ڕۆژە وەکو ئاهەنگێکی خێزانی لێدێ و تا شەوێکی درەنگ هەموو لایەک لە قوتابخانە دەبن. لەپێشدا هەر مامۆستایەی لەگەڵ سەرجەمی دایک و باوکانی قوتابییەکانی کۆبوونەوە دەکەن و مامۆستا باسی ئەوەیان بۆ دەکات کە چییان کردووە و منداڵەکان چی فێر بوون و وەڵامی پرسیارەکانیان نەداتەوەو باسی پلانی داهاتوویان بۆ دەکات، ئینجا دوای ئەوە یەکە یەکە لەگەڵیاندا کۆبوونەوەیەکی کورت دەکات و باسی منداڵەکانیان بۆ دەکات و ئەو پرسیارانەی هەیبێت لە دایک و باوکانی دەکات و ئەوانیش چییان بوویت لەگەڵ مامۆستادا باسی دەکەن. هەموو ئەمانە دەنووسرێن و مامۆستا لای خۆی خاڵ لەسەر ئەو

شتانه دادەنێ کە پێویستە بکرێن بۆ منداڵەکە و یارمەتی بدرێت. چونکە قوتابییەکە لە دوارۆژدا دەچێتە لای مامۆستایەکی تر و ئەو مامۆستایە سوودێکی زۆر لەو نووسراوانەی ئەم وەردەگرێ. لە هۆڵێکی تایبەتیدا یان لە پۆلەکاندا چا و ئیشی هەویر کراوە و ئەوەی جارێ سەرەی نەهاتووە لەگەڵ ئەوەی لێبووەتەوە دادەنیشن و نەختێ دەمەتەقێ بەیەکەوە دەکەن و زیاتر لە بارەی دایک و باوکی هاوڕێی منداڵەکەیان فێر دەبن و دەزانن کە منداڵەکەیان لەگەڵ کێ لە قوتابخانە .هەڵدەستێ و یاری دەکات و ڕووی تری منداڵەکەیان بۆ دەردەکەوێت

لێرەدا دەبێت قوتابیانی بێ دایک و باوکمان بیر نەچێت و چارێکی تایبەت بۆ هەر منداڵێک بدۆزینەوە بەبێ ئەوەی کە کاربکاتە سەر کەسایەتی منداڵەکە و هەست بە کەمی بکات. مام یان خاڵی منداڵەکە پەیوەندی ڕاستەوخۆی پێوە .بکرێت و داوای لێ بکرێت کە لەم چاوپێکەوتنەدا ئامادە بێت

کەواتە بۆئەوەی پەیوەندی قوتابخانە دروست بێت لەگەڵ دایکان و باوکاندا پێویستە لەسەر قوتابخانە کە باسی خۆی بکات بۆیان و داوایان لێ بکات کە بەشداربن لە پەروەردەکردنی منداڵاندا، چونکە هەندێ لەم دایک و باوکانە دەتوانن کاری شارەزایانی ژیان ببینن و وانەی تایبەتی بدەن بە منداڵان، هەتاکو کەسانی شەلوکوێر و کەڕولاڵ و پەککەوتەش دەتوانن باسی باری ژیانی خۆیان بکەن بۆ قوتابیان و هەست و نەستی منداڵان بجووڵێنن، چونکە قوتابخانە تەنها بۆ فێربوونی نووسین و خوێندوە نییە و قوتابی دەبێت توانای ئەوەی هەبێت کە .خۆی بناسێت

گرنگیی یاری

هەردوو پەروەردەکار و دەروونشیکەرەوە هەوڵیانداوە کارو گرنگی یاری دیاری بکەن، دەروونشیکەرەوەکان یاری بەشێوەیەک لەشێوەی هونەر دادەنێن کە دەتوانێ ژیانی مرۆڤ دەوڵەمەند بکات چ لە منداڵیدا و چ لە پیریدا، هەڵسوکەوتی هەمەجۆری یاری ئەو شتانەی کە لە کەسایەتی مرۆڤدایە دەهێنێتە پێشەوە و دەریان دەخات کە زۆر زەحمەتە بە شێوەیەکی تر خۆیان دەربخەن لە ژیانی ڕۆژانەدا، کەواتە یاری دەتوانێ مرۆڤ ڕزگار بکات لەو هەست و نەستەی کە بەندە لە ناخی دەروونیدا.بەپێی تیورییەکی ناسراو یاری هەر بۆ خۆشی نییە، بەڵکو ئامادەکردنێکە بۆ کاری ڕۆژانە لەدواڕۆژدا، گرۆش دەڵێت:"

هەرچی منداڵ دەیکات لەشێوەی یاریدا مەشقێکە بۆ ژیانی داهاتوو" ( گرۆس 1932).

دەتوانین یاری دابنێین بە بەرزترین و پێشکەوتووترین شێوەی پێشکەوتنی مرۆڤ لەتەمەنی قوتابخانەدا، چونکە یاری دەربرینێکی کوتوپڕی لە خۆوەی دڵخۆشییە کە منداڵ دەری دەبڕێت و نیشانی دەدات، کە هەقی خۆیەتی وەکو خۆی بێت. (fr.frobel ).

بەهۆی یاریەوە منداڵ پێش دەکەوێت لەبارەی کۆمەڵایەتییەوە، باسکردنی گرنگیی یاری کارێکی گرانەو هیچ سوودێکی نییە، تەنها ئەوە نەبێت دەبێت بڵێین کە یاری خزمەتی زۆر ئاوات و ئامانج دەکات لەژیانی منداڵدا، هەڵسوکەوتی یاریکردن کێشێکی تایبەتی هەیە لەخۆیداو هەوڵدەدات بگاتە هیوایەک، هەروەکو لە کۆکردنەوەی شتومەکدا دەیەوێت بگاتە ئامانجێک و خزمەتێکی تایبەتی کەسایەتی منداڵ دەکات.

جا بۆیە وەکو مامۆستاو پەروەردەکار دەبێت زیاتر گرنگی بدەین بە یاری و جۆرەکانی پێش بخەین و هەوڵبدەین کە یارییەکان بنووسینەوە بۆئەوەی نەوەکانی دوای ئێمەش سوودی لێوەرگرن و زیاتر هەوڵبدەین منداڵەکانمان بەهۆی یارییەوە لە دەستووری ژیان و بەڕێوەبردنی کۆمەڵێکی دیموکرات و سەربەست بگەن کە ئەندامەکانی نرخی خۆیان و سنووری خۆیان ئەوەندە لەلا بەنرخەکە ڕێزی نرخ و سنووری کەسانی دەوروپشتیان دەگرن. ڕێزگرتنی مافی یەکتری کە منداڵ بەهۆی یاریەوە فێری دەبێت گرنگترە لەبەرکردنی مێژووی لە دایکبوونی(ابو الجهل).

کۆکردنەوە وەکو یاری:

زۆر زەحمەتە شێوەی جۆراوجۆری یاری جیا بکەیتەوە لەو شتانەی بۆ کات بەسەربردن دەکرێن، لێرەدا وێنەیەکی ڕوون دەهێنینەوە، کە ئەویش هیوایەتی شت کۆکردنەوەیە، ئەم کۆکردنەوەیە هەر لە تەمەنی سێ ساڵیەوە دەستی پێکردووە بەڵام لەم قۆناغەدا کۆکردنەوە بەشێوەیەکی هەڕەمەکی و بەبێ دەستوورێکی تایبەتی کراوە. کاتێ منداڵێک لەو تەمەنەدا نایەوێت ئەو هەموو شتانەی کە کۆی کردوونەتەوە فڕێی بدات لەبەرئەوەیە نایەوێت ئەو هەموو شتە (بەنرخانەی)کە کۆیکردوونەتەوە لە ناویان بەرێت. هەر لە سەرەتای تەمەنی

قوتابخانەدا جۆرێک لە کۆکردنەوە کە ئامانجی هەبێت دەست پێدەکات. هەموو شتێک کە منداڵ بتوانێ بیخاتە گیرفانیەوە یاخود کیسەکەیەوە لە خۆی کۆدەکاتەوە و ئیتر هەر لە برغو، بەرد، پەت ، پارچە شووشە، پوول، کاغەزی بنێشت، شقارتە وێنەی جۆراو جۆر، سەرەسۆدە تا هەر شتێکی تر کە دەستی بگاتێ، ئەوەی کە نیشانەی ئەم تەمەنەیە ئەوەیە منداڵ تا ئێستاش بیر هەر لە چەندایەتی زیاتر دەکاتەوە وەک لە چۆنایەتی. هەر لەم تەمەنەدا کۆکردنەوەی ئەو شتانەی پەیوەندی بە زانستە سروشتییەکانەوە هەیە شتێکی ئاشکرایە. منداڵ شتی مردوو و زیندوو کۆدەکاتەوە وەک بۆق. کیسەڵ، کوللە ، زەردەواڵە ، گەڵای دار، بەری دار و ئێسقان ، کۆکردنەوەی دەست پێدەکات وەکو یارییەکی خۆش یاخود پێشبڕکێیەک لەگەڵ هاوڕێکانیدا، ئەم منداڵانە دەست دەکەن بە شت کۆکردنەوە بە شێوەیەکی قووڵ و پشکنینێکی ڕاست کە لەوانەیە بە هیوایەتێکی درێژخایەن دوایی بێت کە لەگەڵ هەموو ژیانیدا دەبێت یاخود وەکو کارێکی پسپۆری بۆ دابینکردنی ژیانی خۆی. لەبەرئەوە ئەگەر بمانەوێ وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەینەوە، کە ئایا کۆکردنەوە وەخت کوشتنە، کارە، یان یارییە ئەوە ناتوانین ئەم وەڵامە بەڕاستی بدەینەوە، بەڵام کاری شت کۆکردنەوە شتێکی بە کەڵکە و بیرکەرەوەیە بۆ منداڵ.

لە تەمەنی 9- 12 ساڵیدا ئەم زەوقە خۆشە بە ئاشکرا دیارە لەلای کوڕو کچ، بەڵام لەوە دەچێت کە زیاتر لەلای کوڕان دیارتر بێت. لە تەمەنی 11- 13 ساڵیدا زەوقی کۆکردنەوە دەگاتە ترۆپک و لەدوای ئەوەی، کە هەموو شتێکیان کۆدەکردەوە ئێستا زیاتر ڕوو دەکەنە ئەوەی کە تەنها یەک شت کۆکەنەوەو گرنگی تەواو بدەن بەو تەنها شتە، بۆ نموونە: پارەی کۆن و پارەی جیاواز و جۆری جیاوازی بەرد، وێنەی وەرزش و وێنەی پاڵەوانانی فیلم و ڕاستی و ...هتد

لەم تەمەنەدا دوو شتی تر زیاد دەبێت بۆ کۆکردنەوە ئەویش (گۆڕینەوە) و (ڕێکوپێکخستن)ە، ئەمە لەبەرئەوەیە کە ئیتر دەست دەکات بە پێشبرکێ. ئامانج لە کۆکردنەوەکە دەبێت بەوەی کە کێ جوانترین و تەواوترین و گەورەترین کۆکراوەی هەیە و هەر منداڵەی دەیەوێت لەوی تر باشتر بێت. بەهۆی ڕێکخستن و باشکردن و بەشکردنی کۆکراوەکان منداڵ زانستییەکی تایبەتی

دەبێت لەبارەی ئەو جۆرە شتومەکانەوە کە کۆیکردۆتەوە کە زۆرجار سەر سوڕهێنەرە بۆ مرۆڤ. ئەمەش لەبەردوو هۆی گرنگ:
1- ئەو زەوقەی منداڵ هەیەتی بۆ ئەم کارە لە ناخی دڵیوە هەڵقووڵاوە
2- مێشکی بەهێزی منداڵەکە لەم تەمەنەدا دەگاتە هەرە پلەی بەرزی
ئەو زەوقە بەهێزەی منداڵ بۆ کۆکردنەوەی دەغڵودان یاخود باڵەفڕە و پەپوولە و بۆق و بەرد و زۆر جۆر شتی تر زانستییەک دەدات بە منداڵ کە هیچ کات قوتابخانە ناتوانێ ئەم زانستییەی بداتێ و گوێدان بە سروشت و ژینگە زیاد دەکات و زیندووی دەکاتەوە. ئەو منداڵە زیرەکەی کە پول کۆدەکاتەوە لەوانەیە ببێت بە پسپۆرێکی جوغرافیا یاخود مێژووناسی ووڵاتان، کە زۆرجار زانینی پێویستە لە پەیوەندی بەینی ووڵاتان و گەلاندا.

مامۆستا وەکو پێشڕەو و سەرۆک:

لە تاقیکردنەوەیەکی بەناوبانگی پسپۆڕی دەروونی(کورت لوین Kurt Lewing بۆ پێوانی کاریگەریی جۆراوجۆری سەرۆکایەتی بۆ سەر کۆمەڵی قوتابی ( پازدە ساڵی، کە بە کاری وەکو یەکەوە خەریکبوون بۆی دەرکەوتووە، کە سێ جۆر سەرۆکایەتی هەیە یاخود سێ جۆر سەرۆکایەتی جیاکردۆتەوە کە ئەمانە:

1- سەرۆکی دەسەڵاتدار:

ئەم سەرۆکە بە تەنها بڕیار دەدات (ئێوە دەبێت...) باسی کارەکانی دەکات هەنگاو بە هەنگاو و کەمترین زانیاری دەدات لەبارەی سەرجەمی کارەکەوە، کۆنترۆڵی تەواوی بەسەر کارەکاندا هەیە ، لێپرسراویەتی تەواوی کارەکە دەخاتە سەر ئەستۆی خۆی، ڕێگای پێشنیارو بیری تازە نادات، پاداشتی هەندێ دەداتەوە و سزای هەندێ دەدات. ڕەخنەگرتن لە خودی کەسەکە دەگیرێ و ڕەخنەکە نێگەتیڤە. ئەندامانی کۆمەڵ دەکرێت بەگژ یەکدا بە بەراوردکردنیان بەیەکتری، ئەم سەرۆکە شوێنێک هەڵدەبژێرێ بۆ خۆی لەسەروو ئەندامانەوە، پەیوەندی لە نێوانی سەرۆک و ئەندامانداا کەمە و بە شێوەیەکی ڕەسمی دەڕوات بەڕێوە، لەسەرەوە بۆ خوارەوە بڕیار دەدرێ و لەناو خۆیاندا ناکۆکن، هەندێ لە

ئەندامانی بە تەواوەتی ئەڵقە لەگوێی سەرۆکن و بەپێی دڵ و خواستی ئەو دەچن بەڕێوە. هەرچەندە خۆشیان باش دەزانن، کە ئەم ڕەفتارەیان ڕاست نییە، هەندێ لە ئەندامانی تر کە ناڕازین بێ دەنگ دەبن.

کارەکان بە باشی دەڕوات بەڕێوە، بەڵام هەر ئەوەندە سەرۆک دیار بێت، پشت بە سەرۆک بەستن وا دەکات کە هەوڵدان و تێکۆشان زۆر کزە، دڵخۆشبوون بەکارو ڕازیبوون لەمجۆرە کۆمەڵەدا زۆر کزە، خوو و ڕەوشتی وەکو زیرەکی و یارمەتی و کۆمەککردن خراوەتە لاوە.

بەرەوپێشچوون و دۆزینەوەی ڕێگای تازە و باشتر و پێشنیاری تازە ڕێگای نادرێ، یەکێتی لەناو کۆمەڵدا زۆر کزە و بەش بەش بوون و لە تۆپەت بوون زۆر ئاساییە، ئەندامانی کۆمەڵ هەوڵدەدەن کە خووی سەرۆک دووبارە بکەنەوەو سەرۆکایەتی تەنهایی بنوێنن، هەقکردنەوەی لە ئەندامانی بێهێز و کەسانی دەرەوەی گرووپەکە شتێکە زۆر ڕوو دەدات.

2- سەرۆکی گوێنەدەر:

ڕۆڵێکی پاسیڤی هەیە و دەتوانین بڵێین، کە لە تەنیشتەوە وەستاوە لە زۆر کات و شوێندا، گرووپەکە خۆی خۆی دەبات بەڕێوە، هەرچەندە کە دەستوور و یاسا سەرپێچی لێ بکرێ و لێی لابدرێ سەرۆک گوێ ناداتێ و هیچ ناکات، چونکە بێدەسەڵاتە و لاوازە و ڕێگا دەدات بە کەسانی تر لە کارەکەی بۆ بکەن، سەرۆکی وا سەرۆکایەتی خۆی دەدات بە کەسانی تر هەرچەندە سەرۆکایەتییەکەی وەرگرتبێ بەهۆی تەمەندرێژیەوە یان زانیارییەوە یان دانرابێ لەسەرەوە.

جۆری بەڕێوەبردنی کارەکان و یاسا و دەستوورەکان تەماوی و نادیارە، ئەو شتانەی کە کۆمەڵ یەک دەخات لاواز و کەمە، هەر کەسە بە هەوەسی خۆی دەکات، یەکێتی کزە لەناو ئەندامانی کۆمەڵدا. یاسای دارستان بەکار دەهێنرێ، بەهێزەکان بێهێزەکان دەچەوسێننەوە، ڕازیبوون لەناو کۆمەڵدا لەسەر ئەوە وەستاوە کە ئایا ئەو کەسە دەسەڵاتدارە یان نا، لەناو کۆمەڵدا ناڕێکوپێکی هەیە،

ئەنجامی کاریان زۆر کەم دیارە جا چ بە ئامادەبوونی سەرۆک یان ونبوونی، سەرلێشێواوی و نادڵنیایی لەناو گرووپدا بڵاوە، زۆر بە ئاسانی پەرش و بڵاودەبنەوە لەکاتی ڕوودانی کارەساتێکی کوتوپڕدا.

3- سەرۆکی دیموکراستیخواز:

ڕۆڵێکی چالاک دەبینێ لە کاروباری کۆمەڵدا و کار دەکات وەکو ئەندامێک لە ئەندامان، بەبێ ئەوەی ڕۆڵێ خۆی لەبیر بچێتەوە وەکو سەرۆک. سەرۆکێکی دەسەڵاتدارە بەبێ ئەوەی زۆر بەکاربهێنێ.

ئامانجی گرووپ نیشانە دەکرێت و ئەندامان ئاگادار دەکرێن لە سەرجەمی کارەکە. بەیەکەوە بڕیاردەدەن بۆ چۆنیەتی کارکردن و دانانی دەستوور و یاسا، لەناو ئەو کۆمەڵەدا سەربەستی ئەندامەکان زۆر گرنگە، بە مانای ئەوەی کە شتێکی خۆیی پاڵیان پێوە دەنێ بۆ کارکردن لە جیاتی زۆری دەرەوە و پەیمانی درۆ و ترس.

پەیوەندییەکی باش هەیە لەناو ئەندامانی کۆمەڵدا و لەگەڵ سەرۆکدا. ئەو ڕەخنانەی کە دەگیرێ ڕەخنەیە لە شت و کارەکان دەگیرێ نەک لە ئەندامانی و بۆئەوەیە کە یارمەتی گرووپ بدا نەک بیڕوخێنێ. یەکێتی بەهێزە لەناو ئەندامەکاندا. بە چاوێکی ڕێزەوە سەیری کاری باشی ئەندامەکان دەکرێت و یارمەتی دەدرێ و ئەندامەکان ڕازین لە ژیانی خۆیان لەناو کۆمەڵدا ئەندامەکان هەست بە بەشداربوون دەکەن و یارمەتی یەکتری دەدەن. کاروبار ڕاپەڕاندن بە شێوەیەکی باش دەڕوات سەرۆک لەوێ بێت یان نا، یەکسانی و سەربەستی و کارامەیی پێشدەکەوێت و یارمەتی دەدرێ لەژێر سایەی ئەم یاسایەدا.

ئەم سێ شێوەیە لە سەرۆکایەتی و بەڕێوەبەرایەتی سێ شێوەی بەناوبانگن و لێرەدا هەر لەبەر ئاسانکردنی باسکردنیان ئاوا بەم شێوەیە(کورت لوین) جیای کردونەتەوە، ئەگینا لە ڕاستیدا ئەمانە زۆرجار تێکەڵن و جیاوازی هەیە لەشێوەی بەڕێوەبردنیاندا بەپێی کات و شوێن.

مامۆستا سەرۆک و بەڕێوبەری پۆڵە و لە قوتابخانەدا مامۆستا سەرۆک و بەرێوەبەری خۆی هەیە کە ئەویش بەرێوەبەری قوتابخانەکەیە و بەرێوەبەریش سەرۆک و بەرێوەبەری خۆی هەیە کە .. ئیتر بەمشێوەیە، ئەمانە هەمووی پێکهاتوون لە مرۆڤ کە کار دەکەن لە ڕێکخراوێکدا و ڕێکخراوەکە پێکهاتووە لە مرۆڤی جیاواز کە هەر کەسەی لە ژیان و پەروەردەو زانست و هەست و نەستدا جیاوازن. لە کۆمەڵێکدا کە سەرۆکی دەسەڵاتداری هەبێت کارەکان زۆر ئاسان و بەبڕیار و ڕوونکردنەوەی سەرۆک کارەکان زوو دەڕوات و بەڕێوە و پێویست ناکات کە کەس پرسیار بکات کە ئەمە ڕاستە یان نا؟ یان ئەگەر ئەنجامەکەی باش نەبوو چی دەبێت؟ سەرۆک و بەرێوەبەر هەموو بەرپرسیارییەکی خستۆتە سەر شانی و ئەگەر کارەکەش سەرنەکەت دەسەڵات و لێپرسراوی بە دەست خۆیەتی هەتاکو ئەو کاتەی دڵی سەرۆکەکانی خۆی ڕازی .دەکات ئەوا بۆی هەیە دەسەڵاتی خۆی بە کار بهێنێ

لە کۆمەڵێکی دیموکراتدا ئەمە جیاوازە و سەرۆک و بەڕێوەبەر بەشدارن لە بڕیارو کاری کۆمەڵدا هەروەکو ئەندامەکانی تر و لێپرسراون بەرامبەر بە ئەنجامی کارەکەیان و ئەرکی سەرشانی ئەندامانیش زۆرترو گرانترە و خۆیان بە بەرپرسیار دەزانن بەرامبەر ئەنجامەکەی و کاتێک کە کارەکە بە ئەنجام نەگەیشت ئەوا گوناهە گوناهی کەس نییە، بەڵکو گوناهی شێوەی ئیشکردنیانە و پێویستیان بە زیاتر لێکۆڵینەوە و شیکردنەوە هەیە بۆئەوەی لە هەنگاوی .داهاتوودا ئەو هەڵە و چەوتیانە ڕاست بکەنەوە

کاری مامۆستا و پەروەردەکار لەم کاتەدا زۆر بە نرخە بۆ کۆمەڵ، مامۆستا ئەندامەکانی کۆمەڵ دەکات بە ئەندامێکی چالاک و بەشداری پێشکەوتنی ژیانی کۆمەڵ دەکەن و بەشدارن لە بەرێوەبەردن و ئەنجامدانی ئەو بریارانەی کە خۆیان داویانەو زیاتر هەست بە لێپرسراوی دەکەن و بڕوایان زیاتر بە توانای خۆیان دەبێت و کەسایەتیان زیاتر بەهێز دەبێت. لە کاتێکدا کە کۆمەڵێک بەڕێوەبەرەکانی کەسایەتیان بەهێز بێت و پەروەردەکارەکانی بەشداری ڕاستەوخۆ بکەن لە بڕیاردان و بەڕێوەبردندا ئەمە دەبێت بەهۆی ئەوەی کە ئەندامانی کۆمەڵیش هەست بە کەسایەتی بەهێزی خۆیان دەکەن و ئەم خووە باشە تەشەنە دەکات لەناو ئەندامەکاندا و ئەوانیش بەشداری گفتوگۆ و

چارەسەرکردنی تەنگوچەڵەمەکانی کۆمەڵ دەکەن. بە مانایەکی تر ئەمە دەبێت بەهۆی دروستکردنی زنجیرەیەک لە کاردانەوە ، هەروەکو چۆن بەردێک فڕێ دەدرێتە ناو ئاوێکی وەستاوەوە ئیتر بازنەکانی ئاوەکە تا بێت زیاتر دەبێت، هەروەها ئەم خووە باشەی سەرۆکیش تەشەنە دەکات و ئەندامانیش چاوی لێدەکەن.

دەسەڵاتی مامۆستا لەم تەمەنەدا:

لە قۆناغی قوتابخانەی سەرەتاییدا دایک و باوک بەبێ شک گەورەترین ڕۆڵ دەبینن لە ژیانی منداڵدا و دەسەڵاتدارن بەسەر منداڵدا، لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆرجار دایک و باوک دەڵێن، ئینجا ئێمە هەرچی بڵێین قیمەتی نییە تەنها قسەی مامۆستا دەخوات و ئەوە دەکات کە مامۆستا پێی دەڵێت ئەمە قسەیەکی ڕاستە چونکە:

لەوانەیە قوتابییەکە شەو داهات بچێت بنوێ لەکاتی تایبەتیدا، (سەعات نۆ) چونکە مامۆستا وتویەتی، منداڵەکە لەوانەیە کە ئیتر پارەکانی نەدات بە شیرینی چونکە مامۆستا وتویەتی کە شیرینی بۆ دانەکانی خراپە و دەبێت شیرینی کەم بخوات و کە خواردی دەبێت دوای ئەوە خێرا بچێت ددانی بشوات، منداڵەکەش ئیتر دەچێت ددانی دەشوات و ئەوەندەش شیرینی ناخوات، چونکە مامۆستا وتویەتی، باوک و دایکیش هەروایان پێ وتوە بەڵام سوودی نەبووە.

ئەمە پەیوەندی بە دەستبەسەراگرتن و دەسەڵاتی مامۆستاوە نییە بەسەر منداڵەکەدا ئەمە پەیوەندی بە (هەستی هەموان) ەوە هەیە، چونکە هەموو منداڵەکانی تر بە قسەی مامۆستا دەکەن لەبەرئەوە ئەمیش بە قسەی مامۆستا دەکات. بەبێ شک مامۆستا دەسەڵاتدارێکی گەورەیە لە ژیانی منداڵدا و منداڵی 7 – 9 ساڵان حەز دەکات بە قسەی مامۆستا بکات، چونکە مامۆستای خۆش دەوێت، بەڵام ئەوەی کە هەموو ئەوانی تر دەیکەن گرنگە هەر لە سەرەتای دەستپێکردنی قوتابخانەوە هەتاکو تەواوبوونی پلەی ناوەندیش، ئەم هەستە زۆر کار دەکاتە سەر منداڵ و هەست دەکات کە ئەم لە گرووپێکە و (هەستی ئێمەی)

ی تێدا بە ئاشکرا دەردەکەوێت و خۆی بە کەسانی تر بەم بۆنەیەوە نەناسێنێ کە
.پۆڵەکەی ئەمان باشترە و ئەمان خۆیان بەیەک گروپ دەزانن

ڕەخنە
وا باوە ڕەخنە باشە و قازانجی هەیە، زۆر کەس ئامانجیان ئەوەیە ڕەخنە بگرن
و خەڵکی فێری ڕەخنەگرتن بکەن بەو هیوایەی بە هۆی ڕەخنەوە بگەنە پلەی
بەرزی ڕاستی و داوا لە خەڵکی تریش دەکەن کەوا بکات و دەڵێن:" پیاو دەبێت
".ڕەخنە قبووڵ بکات

بەڵام ڕەخنە چی دەکات؟
ڕەخنە کەمجار دروستکەرە و ئامانجیش لە ڕەخنە وا دیارە دروستکردن نییە،
بەڵکو ڕووخاندنە جا چۆن پیاو زوو دەگاتە ئەنجامێکی باش بەوەی کە
ڕووخێنەر بێت؟
ڕەخنە مانای ئەوەیە ئەوەی قسەکە دەکات ڕازی نییە بەبیرو زانیاری و هەستی
خەڵکی تر، ڕەخنە دەست ڕادەکێشێ بۆ هەڵەکان بەبێ ئەوەی باسی ئەوە بکات
کەچی بکرێت لەجیاتی، ئەمە مانای ئەوە نییە کە پیاو دەست بۆ ڕەخنە
ڕانەکێشێ، یاخود قسەی خۆی نەکات لە شوێنێکدا کە پێویستە بکرێت، بەڵام لەم
کاتەدا پێویستە ڕەخنەگر لە کەوشەکانی خۆی بێتە دەرەوە و هەوڵبدات تێ بگات
کە ڕەخنەکەی چ کارێک دەکاتە سەر ئەوەی ڕەخنەی لێ دەگێرێ و خۆی لە
شوێنی ئەو دانێ و باسی ئەوە بکات کەچی بکرێت لە جیاتی ئەو شتەی ئەو
.ڕەخنەی لێ گرتووە

ئەگەر ئامانجی ڕەخنەگر ئەوە بێت کە ڕەخنە لێگیراو بچەوسێنێتەوە و تۆڵەی لێ بسێنێتەوە ئەوە بە ئاسانی دەگاتە ئامانجی تەواو. ئەگەر ئامانجیش یارمەتیدان و پێشخستنی بێت ئەوە بە ئاسانی ناگاتە ئامانجەکەی، چونکە ڕەخنە لێگیراو هەست بەوە دەکات کە بە ناهەق دەستنیشان کراوە و مامەڵەی لەگەڵ کراوە یاخو بە هەڵە تێی گەیشتوون یاخود ڕەخنەگر لە ڕاستی نازانێ و لە خۆیەوە ڕەخنە دەگرێت.

ڕەخنەی ئەرێنی(ئیجابی) ئەو ڕەخنەیەیە کە گوێ دەداتە ڕەخنەلێگیراو کە چەند دەتوانێ گوێی لێ بگرێت و بەپێی ڕەخنەکە هەڵسوکەوت دەکات. کەواتە ڕەخنەگر دەبێت بە باشی لە بارو دۆخی کارەکە شارەزا بێت و بناغەیەکی ڕاستی هەبێت بۆ بارو دۆخی کارەکە و بزانێت کارەکە چۆن ڕووی داوە، بەمانایەکی تر لە خۆیەوە تفەنگ بە تاریکییەوە نەنێ و تەنها بە قسەی کەسێک بڕوا نەکات کە ئەو کەسەش لە کەسێکی تری بیستێ و ئەویش لە کەسێکی تر کە هیچیان نازانن ڕاستی مەسەلەکە چییە، زۆرجار مرۆڤ لەبەر بێهێزی کەسایەتی خۆی هەر کە شتێکی بیست خێرا لەگەڵ ڕەخنەگرەکەدا دەنگی خۆی یەک دەخات و ئەویش ڕەخنە لە کەسی سێهەم ئەگرێ، ئەمە نیشانەی بێهێزی و لاوازی کەسایەتییە و پێویستە مرۆڤ گوێی لە هەردوولا بێت بۆئەوەی ڕاستی مەسەلەکەی بۆ دەربکەوێت و حوکمی بەسەردا بدات، هەر بە گوێگرتن لەلایەک مرۆڤ ناتوانێ ڕاستی شت بزانێ.

یارییەکە هەیە کە مرۆڤێک وشەیەک دەچرپێنێ بە گوێی ئەوی تەنیشتیا و ئەویش دەچرپێنێت بە گوێی ئەوی تەنیشتیا و هەروەها تاکو قسەکە دەگاتەوە لای کەسی یەکەم، بەڵام کاتێ کە قسەکە دێتەوە لای کەسی یەکەم لە زۆرجاردا ئەوەندە گۆڕاوە کە ناناسرێتەوە، لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە قسە چەند دەگۆڕێت کاتێک کە دەماو دەم دەکات و لە کەسێکەوە دەچێت بۆ کەسێکی تر ئەم بە هەڵە لە یەکتر گەیشتنە شتێکی مرۆڤایەتییە وشتێکی سەیر نییە و هەر کەسە بە جۆرێک و بە شێوەیەک لە هەمان هەواڵ دەگات لەبەرئەوەی ژیانی هەر کەسێک جیاوازە لەوی تر و بە چاوێکی جیاواز سەیری ژیان دەکات. شتێکی تری گرنگی ڕەخنە ئەوەیە کە پەیوەندی چۆنە لە نێوانی ڕەخنەگر و ڕەخنەلێگیراودا، ئەگەر پەیوەندییان ڕاست و دروست بێت و لەسەر بناغەی

زانستی و خۆشەویستی دروست بوویێت ئەوا ئاسانترە کە ڕەخنە لە یەکتری بگرن.
ڕاستییەکی تریش ئەوەیە چەند ئەو کەسەی ڕەخنەی لێدەگیرێ متمانەی بە خۆیەتی. کاتێ کە پیاو متمانەی بەخۆی نەبوو ئیتر ڕەخنەش کاری ڕووخێنەر دەکات و لە ڕاستیشدا ئەوەی کە زیاتر پێویستی بە یارمەتی بەرزکردنەوەی متمانە هەیە ئەو کەسەیە کە زۆرتر ڕەخنەی لێدەگیرێ.
بۆئەوەی ڕەخنە دروستکەر بێت و ڕووخێنەر نەبێت، بەتایبەتی لەم تەمەنەدا کە منداڵ زۆر متمانەی کزە بەخۆی و تاکو ئێستا کەسایەتی خۆی بە تەواوەتی نەدۆزیوەتەوە، پێویستە مامۆستا و دایک و باوک چاودێری ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەن لەگەڵ ئەو خاڵانەی کە خۆیان بە ڕاستی دەزانن لە پەیوەندی نێوان خۆیان و منداڵەکانیاندا، چونکە وەکو وتمان هەر پەیوەندییەک (باوک – منداڵ) (مامۆستا – قوتابی ) پەیوەندییەکی تاکانەیە و هیچ پەیوەندییەکی تر نییە لەم پەیوەندییە بچێت.

1- ڕەخنە پێویستە خێرا و ڕاستەوخۆ بێت، مرۆڤ نابێت ڕەخنە لە دڵی خۆیدا کۆبکاتەوە و کاتێ کە زۆر بوو بەیەکەوە دەریببڕێ ، ڕەخنە تاکو کەمتر و ڕوونتر بێت باشترە.

2- زۆرجار دەتوانرێت کە ڕەخنە لە شێوەیەکی پۆزەتیڤدا باس بکەیت و لە جیاتی ڕەخنە دەست بۆ ئەو تەواوکەرانە ڕابکێشێت کە کارەکە چاکتر دەکەن، شێوە و جۆری جیاواز بخەیتە بەردەم هەتاکو قوتابییەکە ئەوەی خۆی ئەوەی بە باشی دەزانێت هەڵی بژێرێت .. لەجیاتی ئەوەی باسی ئەوە بکەیت کە ناتەواوە، باسی ئەوە بکەیت کە تەواوکەرە.

3- مرۆڤ لە کاتی ڕەخنەدا پێویستە قسە بۆ خۆی بکات و بۆ کۆمەڵی نەکات.. (من حەز ئەکەم..) لە جیاتی ئەوەی (ئێمە پێمان خۆشە..) (هەمووومان..) چونکە ڕەخنە شتێکی زاتیە. بەڵام هەندێ کەس هەوڵدەدات بەهۆی ئەوەی کە بە ناوی هەمووانەوە قسە بکات دەری بخات کە ئەمە شتێکی دیارە و هەموو کەس دەبینێ لەکاتێکدا کە بە تەنها هەر ئەو وا بیر دەکاتەوە.

4- لە جیاتی ئەوەی لە دەربرینەکاندا وشەی ئاڵۆز و سەیر بەکاربهێنێ هەوڵبدەیت کە تا دەتوانیت لەکاتی ڕەخنەگرتندا وشەی و دەربرینەکان سادە و

ڕوون و ئاشكرا بێت و بە ئاشكرا و ڕێكوپێك دەست بۆ كارەكان ڕابكێشێ، كە بەلاتانەوە باش نییە، پیاو ناتوانێ بە جاری ژیانی كەسێك یاخود ڕووداوێكی گەورە بخاتە ژێر وردبینی ڕەخنەوە و ڕەخنەی لێ بگرێت. پیاو ڕەخنە لە شتێك دەگرێت و ڕەخنە لە (پەیوەندییەك) دەگرێت. پیاو ڕەخنە لە(كاتێك) دەگرێت.

5- <u>پیاو ڕەخنە لە مرۆڤ ناگرێت، ڕەخنە لە شت دەگرێت، ڕەخنە لە</u> كارێك دەگرێت كە مرۆڤێك كردبێتی نەك لە مرۆڤێك كە كارێكی كردبێت، ئەمە زۆر گرنگە كە جیاوازی بكەین لەنێوانی كار لەگەڵ ئەو مرۆڤەی كە كارەكەی كردووە، ڕاستە كە ئەم كارەی ئەم مرۆڤە كردوویەتی بەلای تۆوە باش نییە و ڕەخنەی لێدەگرێ، بەڵام هەمان مرۆڤ لەوانەیە كاری زۆرتری كردبێت كە باش بێت و تەنها بە دڵی تۆش بێت.

كاتێك كە كاری مرۆڤێك بەلای تۆوە هەڵەیە، مانای ئەوە نییە كە هەموو كارێك كە ئەم مرۆڤە دەیكات هەڵەیە، ئەم كارەی كە كردوویەتی لە بارودۆخێكی وادا كردوویەتی كە لە وانەیە ئەگەر بە وردی لێی بكولێینەوە و خۆمان بخەینە شوێنی ئەو بۆمان دەردەكەوێت كە ئێمەش هەر وامان دەكرد. یاخود ئەگەر قوتابییەك هەڵەیەكی كرد كە بەلای تۆوە راست نەبوو، ئیتر مانای ئەوە نییە كە قوتابییەكەت قوتابییەكی خراپە و دەبێت ڕەخنەی لێ بگرێت. بەوەی كە ناوی چییە و لەكوێوە هاتووە و كوڕی كێیە و هەوڵبدەیت لەبەرچاوی هەموو قوتابیانی هاوڕێی وای لە قەڵەم بدەیت، كە قوتابییەكی خراپە. لەلای ئێمە باوە كە خەڵكی كاتێك هەڵەیەكیان كرد ئیتر بكرێن بە نموونە و سەریان بتاشن و لەسەر تەلەفزیۆن پێشانی خەڵكیان بدەن، بۆئەوەی ببن بە عیبرەت. بە قسەی دەسەڵاتدارەكان و لێپرسراوان ئەوە دەبێت بە نموونەیەك بۆ خەڵكی تر و خەڵكی تری پێ دەترسێنن، بەڵام خۆی لەڕاستیدا گەورەترین هەڵەی مرۆڤایەتییە كە دەكرێت بەرامبەر بەم كەسە و كەسایەتی ئەو مرۆڤە هەتا هەتایە بریندار دەكات و بەپێی هەموو مافێكی مرۆڤایەتی ئەم كارە ناپەسەندە و نەكردنی سوودی لە كردنی زیاترە. لەبیرمە منداڵ بووم لە قوتابخانەی سەرەتاییدا و لە پۆلی یەكەمدا بووم كە ڕۆژێكیان منیان لە ڕیز هێنایە دەرەوە و بە جیا ڕایان وەستانم لەولاوە هەروەكو گوناهێكی زۆر گەورەم كردبێت و منداڵان هەموو بەجارێ سەیریان دەكردم و منیش لە شوێنی خۆم هەتا بهاتایە زیاتر ئارەقم

دەکردوەو ترسم زیاتر دەبوو. ئەمە لەبەرئەوە کە گۆرەویم بەکارهێنابوو لە جیاتی دەستەسڕ لەکاتی پشکنینی پاکوتەمیزیدا، کە بەبیری خۆم باشتر بوو لەوەی کە هیچ شتێکم پێ نەبێ، لە ترسانا زوو تاکێک لە گۆرەوەیەکانم داکەندو گرتم بە دەستمەوە ئەوەی لێی فێربووم ئەوەیە کە لەو ڕۆژەوە ئیتر دەستەسڕم نەخستۆتە گیرفانمەوە.

6- وشە هەڵبژاردن و بەرزونزمی دەنگ لەکاتی ڕەخنەدا بە زیرەکی و لەسەرخۆ کە بەپێی خەڵکی و شوێن دەگۆڕێ گرنگییەکی تایبەتی هەیە. لەکاتێکدا کە کەسێک بە وشەیەک تێدەگات و لەوە زیاتر پێویست نییە، کەسانی تر هەن کە پێویستە چەند جارێک پێیان بووترێ و ئاگادار بکرێنەوە بۆئەوەی هەستی پێ بکەن، ئەمە کارێکی زەحمەتە بۆ مامۆستا کە مامەڵەی لەگەڵ دەیەها قوتابی هەیە لە ڕۆژێکدا و نازانێ کێ بە قسەیەک و کێ بە چەند قسەیەک تێدەگات. بەڵام ئەمە لەکاتی گفتوگۆی مامۆستادا لەگەڵ دایک و باوک و لەگەڵ قوتابییەکەدا و لە کاری ڕۆژانەدا فێری دەبێت و بە کارامەیی بەکاریان دێنێت.

7- ئەگەر کەسێک ڕەخنەی لێ بگیرێ لەبەردەم هاوڕێکانیدا مانای ئەوەیە کە ئەو کەسە هەستی بریندار دەکرێ، یاخود وای لە هاوڕێکانی دەکرێت کە بە درۆ لایەنی هاوڕآ غەدرلێکراوەکەیان بگرن، کەواتە هەڵبژاردنی کات و شوێن پێویستە و ئەمە مانای ئەوە نییە کە ڕەخنەکە ڕاستەوخۆ نییە. ئەمە لەوە دەچێت کە زۆر گران بێت و نەتوانرێ هەمووی ڕەچاو بکرێت، بەڵام مامۆستا ئەم هونەرە فێر دەبێت لە کاری ڕۆژانەیدا و ناچاریشە، چونکە ئەو نیشاندەری ڕێگای زۆر قوتابیانە کە چاوەڕوانی ئەوەی لێ دەکەن کە کاری ڕاست بکات و ئەمانیش لاسایی بکەنەوە. جا ئەگەر مامۆستا ڕەخنەگرتنی کرد بە پیشەیەکی وا کە هەر ئامانجی ئەوە بێت ڕەخنە بگرێت و بەس بۆ ئەوەی نیشانی بدات کە تەنها ئەم ڕاست ئەکات و قوتابیان بداتە بەر لێزمەی ڕەخنەگرتن ئەوا پەیوەندی بەینیان تێک دەچێت، ئەمە مانای ئەوە نییە کە مامۆستا دەبێت گوێ بە کاری ناڕەوا نەداو ڕازی بێت بە کاری پڕوپووچ.

.....................دان بە شتی باشدا بنێ.........................

باسی ئەوەمان کرد مرۆڤ باشتر نابێت بەوەی بچەوسێنرێتەوە و باسی خراپەکانی بکەین و پێی بڵێین، کە بێکەڵکە و هیچ نازانێ، چونکە هەموو کەسێک شتێک لە خۆیدا دەبینێ، بیر لە سنوورو توانای خۆی دەکاتەوە گومانی لەوە هەیە کە بتوانێ یان نەتوانێ کارێک بکات. پیاو دەترسێ لەوەی کە بە تەواوەتی باش نەبێت لە کارەکەیدا.

چاوەڕوانی خۆت لە خۆت ئامانجەکان دیاری دەکات و دەگەیتە ئەنجام. جا ئەگەر چاوەڕوانی چاکە بکەیت ئەوا کارەکەت چاک دەبێت و چاوەڕوانی ئەنجامی خراپ بکەیت ئەنجامەکەت خراپ دەبێت. هەروەها چاوەڕوانی خەڵکی لە تۆ هەمان ئەنجامی هەیە، جا بۆیە تۆ لە خۆشنووسیندا سەرکەوتوو نابیت ئەگەر هەمیشە گوێت لەوە بێت کە دەستوخەتت زۆر ناشرینە و مرۆڤ نابێت بە یاری کەرێکی باش ئەگەر هەمیشە گوێی لەوە بێت کە چەند یاریکەرێکی خراپە. بەڵام زۆر بەلاتەوە خۆشە خۆشنووسیی بکەیت کاتێ کە گوێت لێ دەبێت یەکێک دەڵێت کە تۆ جوان دەنووسیت یاخود مەشقی زیاتر دەکەیت و خەریکی فوتبۆڵێن دەبێت کاتێک کە گوێت لێ دەبێت بە باشی باسی یارییەکەت دەکرێت. ئێمە ئەم چاوەڕوانییەی خەڵکی دەکەین بە چاوەڕوانی خۆمان و .ئاواتەکەیان دەکەین بە ئاواتی خۆمان و هەوڵدەدەین کەوا بکەین سەر بکەوین

بەڵام چاوەڕوانێکی خراپ یاخود ڕەخنەیەکی خراپ وا لە ئێمە دەکات کە دژی بوەستین، لەهەمانکاتدا هیچ شتێک نییە بسەڵمێنێت کە بە پێچەوانەکەی ڕاستە، ئەمە وا دەکات کە چاوەڕوانی ئێمەش ببێت بە چاوەڕوانی و ئاواتی ڕەخنەگرەکە و سەرنەکەوین.

لە پشکنینی زانستیدا دەرکەوتووە چۆن چاوەڕوانیی کار دەکاتە سەر ئەنجامی کارەکان. نەک تەنها وشە و دەنگ بەرزی و نزمی و جۆری دەنگەکە بەڵکو زەردەخەنەی خێرا و سەیرکردن و گرنگیدان بە کەسەکە و هتد.....

پێشکەوتن دەبێت بەهۆی پێشکەوتن، پیاو کە سەرکەوت ئیتر هان دەدرێ بۆ ئەوەی کە زیاتر مەشق بکات و ئەوەندەی تر ئەنجامەکەی باش بکات. پرۆسەی پێشکەوتنێک لیرەوە دەست پێدەکات

ئەمە تا پلەیەکی زۆر لە قوتابخانەدا پەیوەندی بە مامۆستاوە هەیە، کاتێ کە مامۆستا دەبیستێ کە کاری چاک دەکات و لە ڕاستیشدا زۆربەی زۆری مامۆستا کارەکەی خۆی بە باشی دەکات، بەڵام کەمجار مامۆستا دەبیستێ کە سوپاس بکرێت. ئەمە دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کاری مامۆستا شاراوەیە و مامۆستا دەنگی خۆی بەرز ناکاتەوە و کەم کەسیش دەزانێ کە مامۆستا چی دەکات، چونکە مامۆستا ڕۆژانەی خۆی بە کەس ناڵێ تاکو تێی بگەن، ڕۆژانەی مامۆستا تەنها قوتابیان دەیزانن کە پێویستیان بەوە نییە ستایشی مامۆستا بکەن، چونکە ئەمان کاری مامۆستا بەهی خۆی دەزانن و لە جیاتی ئەو کارە مووچە وەردەگرێ.

ئەگەر سەیری مێژووی ئەدەبی کوردی بکەیت پڕە لە بەسەرهاتی پاشاو سەپان و جوتیارو حەماڵ، بەڵام کەم کەس باسی مامۆستاو ژیانی ڕۆژانەی مامۆستای کردووە، کە لەوانەیە زۆربەی نووسەران مامۆستاش بن. ئەمە ئەوە دەردەخات، کە چەند مامۆستا گوێی داوەتە کۆمەڵەکەی و خۆی لەبیرچۆتەوە

مرۆڤ زۆر شت دەزانێت، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە بە چاوی نزم سەیریان دەکەین هەر لەبەرئەوەی ئەو شتە نازانن، کە ئێمە بە گرنگی دەزانین، بەڵام ئەگەر دەست بۆ ئەو شتانە ڕابکێشین، کە خەڵکی دەیزانن و ستایشیان بکەین، ئەوانیش بڕوایان بە خۆیان بەرز دەبێتەوە و لە کاتێک کە بڕوایان بە خۆیان بەرزبووەوە ئیتر پێشدەکەون و ژیانیان دەگۆڕێ بە ژیانێکی تر.

بڕوا بە خۆبوون لە ڕاستیدا ئەوەیە، کە بڕوا بەوە بکەی، ئەو ڕێگایەی گرتووتە یان ئەو شتەی، کە هەوڵی بۆ دەدەی ڕاستە، هەرچەندە هەندێ کەس بە هەڵەت بزانن. بڕوات بە خۆت هەبێت، کە کارێکی زۆر زەحمەتت گرتۆتەبەر هەر تەواوی دەکەیت و سەردەکەویت. بڕوات بەوە بێت، کە بەو تەنگوچەڵەمەیەی لە ڕێتدایە بەسەریدا سەردەکەویت و ڕزگارت دەبێت. ئەم بڕوایانە دەبێت بە پلەی گونجاو بێت و لەگەڵ ئامانجەکەدا ڕێک بکەوێت، سوپەرمان و پیاوی خەیاڵاوی ڕێک ناکەوێت لەگەڵ بڕوابەخۆبووندا، هیچ مرۆڤێک نییە کە هێڵێکی ڕاست .بێت و وەکو ڕۆبۆت بەبێ هەست کاربکات

ئێمە وەکو مرۆڤ دوودڵین و شک دەکەین. جاری وا هەیە هەستمان بەرزە و جاری وا هەیە نزم . ڕۆژی وایە تەندروستیمان باشە و دڵمان خۆشە و ڕۆژی

وا هەیە تەندروستیمان خراپە و دڵمان ناخۆشە. ڕۆژی وا هەیە خۆمان بە بەهێز دەزانین و ڕۆژی وا هەیە خۆمان بە لاواز دەزانین، کاتی وا هەیە دڵپاکین و کاتی وا هەیە دڵپیس.. هتد.. ئەمانە نیشانەی لاوازی نییە بگرە ئەمانە نیشانەی ژیانێکی تەواوی مرۆڤە. ئێمە لەگەڵ ئەوەشدا ڕووی جیاوازمان هەیە. لە هەندێ ڕووەوە بە هێزین و لە هەندێکی ترەوە ئەوەندە بەهێزنین، ئەوەی کە زیرەک و بە توانایە لە بارێکەوە لەوانەیە بترسێ و نەشارەزا بێت لە ڕوویەکی ترەوە.

ئێمە چاری تەنگوچەڵەمەکانمان بەشێوەی جیاواز دەکەین، هەندێجار سەردەکەوین و هەندێجار شکمان لە خۆمانە، گرنگەکە بزانین کە چۆن بڕوامان جیاوازە لە کاتی جیاوازدا، چونکە هەموومان دەتوانین پێش بکەوین و باشتر ببین، بەڵام ئەگەر ئامانجت ئەوە بێت کە ببیت بە سوپەرمان ئەوا لە ئێستاوە دۆڕاویت، پێش ئەوەی دەستت پێکردبێت. ئێمە زۆر شێوەی جیاوازمان هەیە بۆ بەرەنگار بوونەوەی ژیانی منداڵێکی دە ساڵان لەوانەیە بڕوای بەخۆی نەبێت و خۆی لە ناو چاکەتێک یان قەمسەڵەیەکی جوانی قەشەنگەدا بشارێتەوە، یەکێکی تر بڕوای بە خۆیەتی هەرچەندە لە بارێکی نالەباردا دەژی ، لەبەرئەوە کار دەکات بۆ چارەسەرکردنی ئەم بارە.

جلی سەوز و سوور و قەشەنگ کە هەندێ کەس زیاد لە پێویست گرنگی پێدەدەن نیشانەی بڕوا بەخۆ نەبوونە. هەموو کات تۆ باشتر بزانیت لە خەڵکی تر و هەر تۆ ڕاست ببیت نیشانەیەکی تری بڕوا نەبوونە بە خۆ، چونکە ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە لەوە دەترسێ کە نەتوانێ دەست بەسەر هەموو شتێکدا بگرێت.

لە هەموو شتێک بزانی، هەرگیز شکت نەبێت لەوەی کە تۆ هەموو شتێک دەزانی، ئەمەش نیشانەی بڕوا بەخۆ نەبوونە. بڕوایەک کە لە ناخی دەروونەوە هاتووە و پێگەیووە دەبێت بە بەشێک لە کەسایەتی مرۆڤ و لێی جیا نابێتەوە لە کاتێکدا ئەم بڕوا ناسەرەکییانەی مرۆڤ کە باسمان کرد هەمووی نیشانەی ئەوەن کە بڕوای بە خۆی نییە لە کەمترین هەورازی ژیاندا و لە لێقەومانێکی کوتوپڕدا بە ئاسانی دەشکێ و دەبێت بە سەدان پارچەوە. مرۆڤێک لەوانەیە وا دەربکەوێت کە خەفەتبارە و ترسی هەیە، بە ئاسانی ڕووی سوور هەڵدەگەڕێ و دڵەڕاوکێی پێ دەکەوێ و زمانی لاڵ دەبێت و دەترسێ شتی تازە تاقی بکاتەوە و سەری لێ

تێک دەچێت لە هەندێ شوێنی تایبەتیدا، ئەمانە لەوانەیە ڕووکەش بێت و لەگەڵ کەسایەتی ڕاستی مرۆڤەکەدا ڕێک نەکەوێت. ئەمانە لەوانەیە شتێکی کاتی بن و نەمێنن، چونکە هەر هەمان مرۆڤ لەوانەیە ئەوەندە ئازایەتی تێدا بێت کە بگەڕێ بەدوای وەڵامدا، مرۆڤێکی بەهێز بێت لەکاتی تەنگانەدا و ئەوەندە ئازابێت بتوانێ بەرەنگاری ڕاستی ببێت و زۆرجار بتوانێ خۆی ڕابهێنێ لە شوێن و کاتی سامناکدا و کاری گەورە بکات، بتوانێ خۆی بگۆڕێ بەبێ ئەوەی ژیانی خۆی و دەستوور و یاسای ویژدانی بڕوخێت، مامۆستایەک کە خۆی ناگۆڕێ بەپێی هەوەس و زەوقی قوتابییەکان و سوورە لەسەر ئەو شێوەیەی کە بڕوای پێیەتی کە بۆ سوودی قوتابییەکانە، دەبینێت کە چۆن ڕێزی تاکو بێت زیاد دەکات و دەبیێت بە شوێنی بڕوا و متمانەی قوتابییەکان وەک لە مامۆستایەک کە ڕێگایەکی تایبەتی هەڵبژاردبێ و نەتوانێ قوتابییەکان ڕازی بکات بە ڕێگایەکی ڕاست.

مرۆڤ دەتوانێ بڕوای خۆی قایم بکات و پێی بگەیەنێ بەوەی کە خۆی پاک بکاتەوە لە شتی ڕووکەش و بیری چەوت و ناتەواو لە بارەی خەڵک و کاری خەڵکەوە. خۆی پاک بکاتەوە لە بیری چەوت لە بارەی بڕوا بە خۆ بوون و کاتێک تەرخان بکات بۆ باسکردن لەگەڵ خۆیدا، ئایا بڕوا بەخۆبوون چییە؟ دوای ئەوە ئیتر بیری بڕوا بەخۆبوونی وردە وردە دەگەشێتەوە و دەست دەکات بە کۆکردنەوەی زانستی و مەشقکردنەوەی تازە کە ئەمە بە مرۆڤ و پلەی زانیاری دەگۆڕێت و کاتی خۆی دەوێت بۆئەوەی پێ بگات و ببێت بەبەشێک لە مرۆڤ.

زۆر کاری باشی تریش لەم ڕێگایەدا دێتەدی، پیاو باشتر پەیوەندی دەکات بە خەڵکی ترەوە یاخود دەبێت بەهۆی باشبوونی بەکارهێنانی ئامێری پەیوەندی کە ئەویش گفتوگۆکردنە لەگەڵ خەڵکیدا، کە ئەمەش دەبێت بەهۆی ئاسایشی ڕۆحی و ڕێگا دەدات بە خاوەنەکەی کە ڕێگای خەڵکی بدات خۆیان پێش بخەن و ئەوانیش وەکو ئەمیان لێ بێت، کارەکە دەبێت بە کارێکی دووسەری ، هەم خۆی پێدەگات و هەم خەڵکیش پێدەگات. لەبەرئەوە تۆ پێویستت بەوە نییە کە ئەو کارە بکەیت کە هاوڕێکانت حەز دەکەن کە تۆ بیکەیت (لەبەرئەوەی لەوانەیە ئەوان خۆیان باش بن لەم کارەدا) بەڵکو ئەوە بکە کە خۆت حەزی لێدەکەیت و

خۆت دەزانی کە دەتوانی بیکەیت و بگەیتە ئامانج بەوشێوەیەی کە خۆت دەتەوێ نەک بەو شێوەیەی کە ئەوان دەیانەوێ. نەک لەبەرئەوەی کە تۆ دەتەوێت دەری بخەیت کە تۆ جیاوازی، بەڵکو لەبەرئەوەی کە تۆ دەتوانیت، نەک لەبەرئەوەی نیشانی بدەیت کە تۆ کەللەڕەقی ، بەڵکو لەبەرئەوەی کە تۆ خۆت حەز دەکەیت.

گرنگیی وشە..............................

(interplay) پەیوەندی لەنێوان مرۆڤدا بریتیە لە هاوکاری کردن

ئێمە پەیوەندی بە یەکەوە دەکەین بەهۆی جوولانی دەست و پێ و دەموچاو و . هەناسە هەڵکێشان و سەر لە قاندن و چاو داگرتن و دەنگ و داننان بە وشەدا و بەهۆی وشەوە. بەڵام وشە لەوانەیە وا بەکاربهێنرێ، کە خەڵکی بە هەڵە لێی تێ بگەن. یان باسی ڕاستیی شتەکە بکەن، بەشێوەیەکی هەڵە یان زیادو کەم. یاخود هەمان وشە لەوانەیە وا بەکاربهێنرێ کە ڕێگای پەیوەندی دابخات. کاتێ باسی کارێک یان خوویەک یان ڕەوشتێک دەکەین ، ئەمە دەکرێت بە بەراوردکردنی لەگەڵ کارو خووی تردا. مرۆڤێک کە درێژییەکی ئاسایی هەبێت بە درێژ دەژمێردرێ کاتێ کە بەراورد دەکرێت لەگەڵ کەسێکی کورتدا، بەڵام بە کورت دەژمێردرێ بە بەراورد لەگەڵ یاریکەرێکی باسکەدا. هەرکەسێک بەشێوەیەکی جیاواز ڕووداوەکان شی دەکاتەوە، چونکە هەر کەسە زانیارییەک و پەروەردەیەک و مێژوویەکی جیاوازی هەیە و کار دەکاتە سەر ئەوەی کە چۆن سەیری ڕووداوەکە دەکات و چۆن بە ڕاستی دەیبینێ هەروەک کە چۆن کەسێکی تر بە شێوەیەکی تر دەیبینێ و بەلایەوە ڕاستە.

زۆرجار خۆمان لە پشت کۆمەڵەوە دەشارینەوە و وشەی وا بەکاردەهێنین کە دەری دەخەین کە کۆمەڵ وای دەوێت: ( قوتابخانە دەیەوێت کە ئێوە ..) (هەموو کەسێ دەزانێ کە ماتماتیک ..) (پیاو ناتوانێ..).زۆرجار مامۆستا هەڵدەخەڵەتێنرێ بەوەی، کە یەکێک یان دووان لە قوتابییەکان دەڵێن : (ئێمە ..) و بەناوی پۆلەوە قسە دەکەن، بەڵام کاتێک نزیکتر سەیری ئەم (ئێمە ..) یە دەکەین دەبینین کە بریتیە لە یەک یان دوو قوتابی و زۆر ڕاوبۆچوونی جیاواز

هەیە لە پۆلەکەدا و وشەی (ئێمە..) تەنها بریتییە لە (من) ێک کە بڕوای بە خۆی نییە.

وشەی وەکو (هیچ، هەموو) زۆرجار کە بەکاردەهێنرێ (من هیچ تێ ناگەم) ڕێگای هەموو گفتوگۆیەک دەگرێ و ڕێگا لە مامۆستا دەگرێ کە ئیتر بتوانێ یارمەتی قوتابییەکە بدات، کاتێ کە قوتابییەک (هیچ) تێنەگەیشتبێ ئیتر مامۆستا دەستەوەسان دەبێت و نازانێ چی بکات، ئەگەر وشەی بەرامبەر بەکارنەهێنرێ و وەڵامی قوتابییەکە نەدرێتەوە بەوەی کە مامۆستا پێی بڵێ ( پێم بڵێ چییە ئەو شتەی کە تێی نەگەیشتووی؟) چونکە زۆرجار ڕوو دەدات کە قوتابییەکە تەنها خاڵێکی تایبەت لە باسەکە تێنەگەیشتووە و لەبەرئەوەی کە ئێستا قوتابییەکە بیر لە باسەکە بە گشتی دەکاتەوە و دەیەوێت وەڵامی هەموو شتەکە بزانێت، ئیتر لەبەر بێکاتی و پەلەپەلی خۆی و ترسی ئەوەی کە لە بیری نەچێتەوە وا دەزانێ کە (هیچ) نازانێت، بەڵام لەڕاستیدا وا نییە و هەر زانستێەک بدرێت بە قوتابییەکە لە مێشکیدا کۆی دەکاتەوە و ڕۆژێ لەڕۆژان بەکاری دەهێنێ.

ڕاستی هەموو کات سپی یا ڕەش نییە، بەڵام لەلای زۆر قوتابی وایە، کە دەیەوێت شت بەم شێوەیە ببینێ. دەڵێت : (ئەمە مەحاڵە..) بەم وشەیە دیوارێک دروست دەکات و ڕێگا لە خۆی و مامۆستا دەبەستێتەوە، بەڵام وشەی (شتێکی گرانە) دەرگایەک دەهێڵێتەوە کە پیاو لێیەوە بتوانێ بچێتە دەرەوە و هەوڵبدات.

زۆر کەس داوای وەڵامی (ڕاست) و خێرا دەکەن، داوای وەڵامی سادەو زانستی سادە دەکەن، دەیانەوێت کە جیهان و کۆمەڵ بەپێی خواستی ئەوان بێت و ئەوەی کە ئاسانە بۆیان بێتە بەردەست، ئەمجۆرە کەسانە شت ئاسان دەکەن و دەیانەوێت بە ئاسانترین شێوە باسی شت بکەن و تەنگوچەڵەمەکانیان چارەسەر بکەن، چونکە ئەمەیان ئاسانترە ( توانا پیاوی خراپە..) ئیتر پێویست ناکات لە ژیانی توانا بکۆڵێتەوە و ڕووەکانی تری و خووەکانی و کارە باشەکانی توانا باس بکات.

بەش و گرنگی کاری مامۆستا ئەوەیە کە قوتابیان فێری بەکارهێنانی (جۆری وشەکان) بکات، چونکە چەکی وشە چەکێکی کاریگەرە (زۆرجار..) (جاری واهەیە..) (ئەمە پەیوەندی هەیە .) (لەم کاتەدا..) (هەندێجار..) وشەی (نەء) کە

مامۆستا پێویستە کەم بەکاری بهێنێ و باشتر وایە کە وازیشی لێ بهێنێ، چونکە وشەکە وا دەخاتە بیری قوتابی کە نابێت شتێک بکات، وشەی قەدەغەکردنە، (کتێبەکەت لەبیر نەچێت) ئەمە ڕێژەی دژایەتیکردنی زیاترە وەک لەوەی کە .(بڵێیت: (بیرت بێت کە کتێبەکە لەگەڵ خۆت بهێنێ

ئەگەر مرۆڤ بیەوێت تەنگوچەڵەمەیەک بە ئاشتی چارەسەر بکات، ئەوا پێویستە کە وشە بەکاربهێنێت بۆئەوەی ناڕەزایی خۆی دەربڕێ، ئەمە وتنی ئاسانە بەڵام لە ڕاستیدا زۆر گرانە، چونکە زۆربەی زۆرمان وا کار دەکەین کەوا دەزانین خەڵکی چاوەڕوانی ئەوەمان لێدەکات. چونکە دەربڕینی هەست و نەستمان و دارشتنی لە قاڵبی جیاوازدا کار دەکاتە سەر ئەنجامەکەی و دەیگۆڕێ . ئەگەر تۆ بڵێیت:( بەڕاستی تۆ ڕقم هەڵدەسێنێ هەمووجارێک کە تۆ ..) ئیتر مرۆڤەکەی بەرامبەرت دەکەوێتە سەنگەرەوە و خۆی دەپارێزێ لە پەلاماردانی تۆ و باشترین خۆ پاراستنیش ئەوەیە کە پەلامارت بدات ئەمە بازنە شەڕانییەکە دروست دەکات کە دوایی نایەت (پەلامار – خۆپاراستن- پەلامار) لەجیاتی ئەوەی کە دەتوانرا ناڕەزاییەکە بە شێوەیەکی تر دەستی پێ بکردیاە وەک ( من ئێستا ئەوەندە لە تۆ تووڕەم چونکە..) لێرەدا لەوانەیە دەرگایەک بەکراوەیی بهێڵێتەوە بۆ گفتوگۆ و دیالۆگ، و هەردووکتان ڕاوبۆچوونی خۆتان بخەنەڕوو و لەئەنجامدا بگەنە دەردەنجامێک هەرچەندە لە پێشدا دەنگ بەرز و تووڕە بوون، چونکە کاتێ تۆ دەست بە قسە دەکەیت و دەڵێیت: ( من لە جیاتی تۆ..) بەمە دەتەوێت هەستی خۆت دەربڕێ و خۆت دەزانی چۆن هەست دەکەیت و ئەوی تر گوناهبار ناکەیت بەوەی کەچی دەکات و چی ناکات، گرنگە ئەوەیە کە تۆ هەستی خۆت باس بکەیت نەک هەستی ئەوی تر، ئەمە مانای ئەوە نییە کە پیاو دەتوانێ هەموو تەنگوچەڵەمەیەک چارەسەر بکات بەوەی بەڕاستی هەستی خۆی دەربڕێ، بەڵام بەلای کەمەوە وا لە بەرامبەرەکەت دەکات کە لە هەستی تۆ بگات و بزانێ بۆچی تۆ تووڕە بوویت و لەوانەیە وای لێ بێت کە هەقیشت بداتێ کە تووڕە بوویت و دان بەوەدا بنێ کە ئێوە دوو کەسی جیاوازن و کەس نییە لەوی تر بچێت، کاتێ کە مرۆڤ گەیشتە ئەم قەناعەتە ئەوە ئیتر لێبووردن ئاسانە و ئەمەیش گەورەترین و بەرزترین بەهرەیە کە مرۆڤی تێگەیشتوو هەیەتی کە داوای لێبووردن بکات کاتێ کە بۆی دەرکەوت کە هەڵەی کردووە و

بە هەڵە لەبەرامبەرەکەی گەیشتووە و بەمە دەتوانرێت هەندێ شەڕو شۆڕی ڕۆژانە کەم بکرێتەوە.

ئەمانە هەمووی پێویستی بە قسەکردنە و لە قسەکردن و ڕاهێناندا مرۆڤ فێری بەکارهێنانی ئەم شتانە دەبێت، لێرەدا دەبینین کەوتووێژ لەگەڵ قوتابی و لە نێوان قوتابیاندا چەند گرنگە و چۆن کار دەکاتە سەر کەسایەتی قوتابیەکان. مامۆستا کەرەسەیەکی زۆر بە نرخە بۆئەوەی نەوەیەکی پێشکەوتوو پێبگەیەنێ و مامۆستا ئامێرێکی زۆر کاریگەر لەبەردەستدایە کە یارمەتی بدات پێ بگات و بگەشێتەوە، بەڵام پێش هەموو شتێک دەبێت خۆی نموونەی ڕاستی بێت بۆ قوتابیان و هەوڵبدات بە کردەوە و بە قسە نیشانی قوتابیانی بدات کە ئەوەی دەیڵێیت بەڕاستییەتی. ئەوەی کە لێرەدا بە گرنگ دێتە بەرچاو و خامۆشکراوە لە قوتابخانەکاندا گێڕانەوەی چیرۆکە بۆ منداڵان و وێنەکردنی چیرۆکەکەیە لە لایەن منداڵانەوە، ئەمە زۆر گرنگە، کاتێ کە زانیمان ئەو منداڵانەی کە زۆر شەرمن و لاتەریکن لە پۆلدا دەتوانن بەهۆی وێنەکێشانەوە هەستی خۆیان دەربڕن و دوایش بکەونە قسەکردن. جا بۆیە بە پێویستییەکی نەتەوەیی دەژمێردرێ کە چیرۆکە کۆنەکانی کوردەواریمان کۆبکرێنەوە و بەپێی پلەی بەرزونزمی پۆلەکان بۆ قوتابییەکان بگێڕدرێنەوە .

چارەسەرکردنی تەنگوچەڵەمە لە قوتابخانەدا

ئەگەر ئێمە باشتر لەهەموو ڕوویەکەوە قسە لەگەڵ یەکتری بکەین لە بارەی ئەو تەنگوچەڵەمانەی کە ڕوودەدەن، ئەمە دەبێت بەهۆی پێشکەوتنی مێشک و هەست و نەستی هەموو لایەک، چونکە تەنگوچەڵەمە و ئاژاوە زۆرجار شتێکی پۆزەتیڤی لەگەڵدایە و دەبێت بەهۆی ئەوەی کە مرۆڤ زیاتر پێ بگات. چەند مامۆستا کاتی خۆی تەرخان بکات بۆ چارەسەرکردنی ئەو تەنگوچەڵەمانەی کە لە ناو قوتابیان و لە قوتابخانەدا ڕوودەدەن، ئەوەندە زیاتر کار دەکاتە سەر پێشکەوتنی زیرەکیی منداڵەکان بۆ چارەسەرکردنی تەنگوچەڵەمەکانی ژیانیان لە دواڕۆژدا، ئەگەر گەورەکان و پەروەردەکارەکان توانای چاکیان هەبێت بۆ

چارەسەرکردنی تەنگوچەڵەمە ئەوە ئیحتمال زۆرە کە منداڵەکانیش وەکو ئەوان بن، مامۆستا دەتوانآ بزانێ کە منداڵەکان لە ماڵەوە چۆن تەنگوچەڵەمەی خۆیان چارەسەر دەکەن، بەوەی سەیری ڕەفتاری منداڵەکان بکات لە کاتی چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانیاندا. ئەگەر دایک و باوک ئازاری دەروونی و لەشی بەکاربهێنن لە ماڵەوە ئەوا منداڵەکەش هەر هەمان چەک بەکاردەهێنێ لە قوتابخانە و بە پێچەوانەوە، ئەگەر ڕێگای گفتوگۆ بگرنە بەر ئەوا منداڵەکەش هەر هەمان چەک بەکاردەهێنێ چ لە ئێستا و چ لە دواڕۆژیشدا، چونکە دەڵێت :" سەرجەمی ژیانی منداڵی هەردەم ( Tove Ditelusen) هەروەکو دووبارە دەبێتەوە لەهەموو ژیاندا :" و ئەمە پەیوەندی بە کارو زانست و بوون و نەبوونی دەرامەتەوە نییە.

کاتێ مرۆڤەکان زۆر لە یەکەوە نزیکن و دەزانن کە هەردوولا نازی یەکتر دەکێشن، ئیتر مرۆڤەکان لە ڕەفتاریاندا چەند هەنگاوێک دەگەڕێنەوە دواوە و ڕەفتاریان سادە دەبێتەوە و پشتی لێ دەکەنەوە و هەست و نەست و ڕەفتاری خۆیان بە ڕاستی دەردەبڕن، کە ئەمە زۆرجار (ئەم نزیکبوونەوەیە) دەبێت بەهۆی دروستبوونی تەنگوچەڵەمە لەنێوان ئەم دوو مرۆڤەدا. کەواتە زۆربەی زۆری تەنگوچەڵەمە لەنێوان کەسانێکدا ڕوودەدات کە لە ڕاستیدا یەکتریان خۆش دەوێت و لە یەکەوە نزیکن، ئەمە گرنگە بیزانین لەکاتی چارەسەرکردنی تەنگوچەڵەمەدا چونکە ئیتر پێویست ناکات بەدوای خەتاباردا بگەڕێین، چونکە ئەمە شتێکی ئاساییە لەنێوان دوو مرۆڤدا کە لە یەکەوە نزیکن.

زۆرجار مامۆستا دەبینێت کە دوو قوتابی لەناو گۆڕەپانی قوتابخانەکەدا پەلاماری یەکتریان داوە و یەکتری دەگەوزێنن، بەڵام زۆر ناخایانێت لەدوای شەڕەکە منداڵەکان بەیەکەوە یاری دەکەن و شەڕەکەیان لەبیر چۆتەوە، یاخود زۆرجار لەوانەیە مامۆستا هیچ تەنگوچەڵەمەیەک نەبینێ لەناو قوتابییەکاندا و قوتابیان هەموو ڕێک دانیشتوون و لەوە دەچێت کە زۆر ڕازی بن، بەڵام لە ڕاستیدا دەیەها تەنگوچەڵەمە لەناو قوتابییەکاندا سووڕ دەخواتەوە و ئاسمانی پۆلەکەی لێڵ کردووە کە بەلای کەمەوە ڕێگا نادات بەهەندێ قوتابی شت تێبگەن، تا وایان لێ دێ ناچار دەبن کە دەست بکەن بە سەرلێشێواندنی ئەوانی تریش بۆ ئەوەی پیشانی مامۆستای بدەن کە ئەمانە ئامادە نین بەم بارودۆخەی

ئێستا تێیدان گوێ لە مامۆستا بگرن، بەڵکو هاوار دەکەن بۆ یارمەتی. ئەمە گرنگییەکی زۆری هەیە بۆ سەرجەمی کەشی ناو پۆلەکەی و گەیشتن بەو ئامانجەی کە مامۆستا چاوەڕوانی دەکات کە قوتابییەکان بی گەنێ، جا ئەگەر لە کاتێکی وادا مامۆستا تەنگوچەڵەمەکان بکات بەژێر لێوەوە و گوێیان نەداتێ ئەوە ئیتر گەیشتنی بە ئامانجەکەی زۆر گرانە و بە تووڕە بوون و چاو سوورکردنەوە ناگاتە هەمان ئامانج و کارەکەی بە فیڕۆ دەچێت. لەوانەیە مامۆستا قوتابییەکانی تاقی بکاتەوەو بزانێ تا چەند تێگەیشتوون و پرسیاریان لێ بکات بۆ ئەوەی کە سەر پشک بێت لە ئەنجامی کارەکەی و کاتێ کە دەبینێ کە قوتابییەکان وەڵامی پرسیارەکان دەدەنەوە ئیتر دڵی خۆی خۆش دەکات، بەڵام ئەمە سەنگی مەحەک نییە و زۆرجار قوتابییەکان و هەروەکو تووتی شت دەڵێنەوەو لەڕاستیدا تێگەیشتنەکەیان کاتییە و لە ماوەیەکی کورتدا باسەکەیان لەبیر دەچێتەوە. ئەمەش هۆیەکەی زۆرجار دەگەڕێتەوە بۆ کەشی ناو پۆل و بۆ ئەو تەنگوچەڵەمانەی لە ئاسمانی پۆلدا بەبێ چارەسەر دەخولێنەوە.

(INTERVJU چۆن لە منداڵ دەگەین (هەڤپەیڤین

ئەگەر مرۆڤ بیەوێت لە بیری منداڵ بگات، شتێکی ئاساییە کە پرسیاری لێ دەکات کە چۆن بیر دەکاتەوە لە بارەی شتی جیاوازەوە ، ئەوەی کە مرۆڤ لە منداڵەوە فێری دەبێت زۆر بە نرخە و زانستییەکی تەواوە بۆ ئەوەی بتوانێت هەڵسوکەوت بکات لەگەڵ منداڵدا بە شێوەیەک کە یارمەتی منداڵەکە دەدات بۆ پێشکەوتن و باشترین ڕێگەیش بۆ تێگەیشتنی بیری منداڵ ڕێگای لەگەڵ یەکتردا قسەکردنە. لە ئەنجامی ئەمەدا مامۆستا دەتوانێ پلەی وانەکان وا لێ بکات کە بگونجێن لەگەڵ پلەی زانیاری قوتابیاندا و هەر بەهۆی قسەکردنەوە دەتوانێت کار بکاتە سەر بیری منداڵ بۆ بیرکردنەوە و پلەی بیرکردنەوەی منداڵ بەرز بکاتەوە.

جیهانی منداڵ جیاوازە لە جیهانی بیری گەورەکان، ئەمە هەموو مامۆستایەک دەیزانێ، بەڵام چۆنیەتی بیرکردنەوەی منداڵ و کارکردنە سەر کاری ڕۆژانەی زۆری لێ نەزانراوەو زۆر بیری لێ نەکراوەتەوە. کاتێک مامۆستا بۆی

دەردەکەوێت کە جیهانی منداڵ چۆنەو منداڵ چۆن سەیری ژیان دەکات ئیتر بە لایەوە زەحمەتە کە واز لەم پشکنینە بهێنێت و سەرسامی خۆی دەرنەبڕێ هەر جارەی شتێکی تازەی بۆ دەردەکەوێت. منداڵ شت فێر دەبێت کاتێک کە خۆی بەشدار دەبێت لە ڕووداوێکدا، کەواتە پێویستە مامۆستا زانیاری و زانستی منداڵ ڕێکوپێک بخات و وای لێ بکات کە خۆی بیربکاتەوە، منداڵێک کە لە بارودۆخێکی وادا گەورە نەبووبێت کە یارمەتی بدرێت کە خۆی بیر بکاتەوە، لە پێشکەوتن دەوەستێت، کەواتە لەسەر مامۆستا پێویستە لە لایەکەوە کە پلەی زانیاری منداڵ بپشکنێ و لەلایەکی ترەوە یارمەتی بدات لەوێوە بەرەو پێشی بەرێت، ئێمە هەرگیز وەکو مامۆستا ناتوانین لە منداڵ بگەین کە چۆن بیر دەکاتەوە، بەڵام دەتوانین تەنگوچەڵەمەی ڕاست بخەینە بەردەمی بۆئەوەی خۆی بیری لێ بکاتەوە و بەهۆی ئەو زانیاری و زانستییەی کە هەیەتی چارەسەریان بکات. ئەمە مانای ئەوەیە کە موقابەلەکە لە خۆیدا ئامێرێکە بە دەست مامۆستاوە کە یارمەتی پێشکەوتنی منداڵی پێ بدات، (دۆناڵدسۆن Donaldson ) دەری خستووە کە ئەو منداڵانەی کە پرسیاریان لێ دەکرێتەوە وەکو (مەبەست چییە؟) بە مانایەکی تر کە پرسیاریان لێ دەکرێتەوە کە باسی شتێک بکەن یان زیاتر ڕوونی بکەنەوە، زووتر شوێنی خۆیان دەدۆزنەوە لە کاتی قسەکردن و گفتوگۆدا.

هەروەکو چۆن گەورەکان، هەروەها منداڵانیش توانای جیاوازیان هەیە لە بارەی ئەو زانیاریەی وەری دەگرن و هەر منداڵەی بە جۆرێک لە شت دەگات و بە جۆرێکی لێکی دەداتەوە و دەیهێنێتە پێش چاوی خۆی.

لە پرسیارێکدا کە لە منداڵان کراوە لە بارەی ئەوەی کە چۆن لە قوتابخانە گەیشتوون و چۆن فێری خوێندنەوە بوون؟ ئەم بەشانەی خوارەوە دەستنیشان کراون:

بەشی یەکەم : خوێنەرێکی باشن و لە مانای خوێندنەوەو نووسین گەیشتوون و ئەمانە بە زوویی فێر دەبن.

بەشی دووەم: کەمتر زیرەکن لە فێر بوونی خوێندنەوەدا ئەمانە وای لێک دەدەنەوە کە قوتابی لە قوتابخانە فێری خوێندن و نووسین دەبێت و خوێندنەوەو

نووسین ڕەوشتێکە کە پەیوەندی هەیە بە ژیانی قوتابخانەوە و شتێک نییە کە مرۆڤ سوودی لێ وەرگرێ لە ماوەی هەموو ژیانیدا.

بەشی سێیەم : زۆر لە دواوەن لە بارەی خوێندنەوە، ئەمانە خۆیان فێر کردووە کە لاسایی مامۆستا بکەنەوە، پیتەکان بنووسنەوە وەکو خۆی بەبێ ئەوەی بزانن کە بۆچی و لەبەرچی ئەمانە لە قوتابخانەن یاخود فێری نووسین و خوێندنەوە ئەبن.

لەبەرئەوە شارەزایانی زمان بڕوایان وایە کە هەمان تەنگوچەڵەمە هەیە لە کاتی فێربوونی شتی تریشدا. بە مانای ئەوەی کە پەیوەندی هەیە لەنێوان ئەوەی کە منداڵ چۆن لەسەرجەمی مەسەلەکە تێگەیشتووە و چۆن و بە چ شێوەیەک منداڵەکە فێر دەکرێت و فێر دەبێت ، جا بۆیە ئەگەر بمانەوێ منداڵ بیری پێش بخات و پێش بکەوێت لەفێربووندا دەبێت بزانین منداڵ چۆن لە شت گەیشتووە و چۆن سەیری دەوروپشتی دەکات و لەوێوە یارمەتی منداڵ بدەین بەرەوپێش بڕوات. کاتێ کە مامۆستا وانەکەی خۆی دەڵێتەوە زۆرجار کەمێکی ئەو زانیارییە لە بیری قوتابیاندا دەمێنێتەوە، ئەمە دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە مامۆستا وانەکەی دەڵێتەوە و لە سووچی خۆیەوە سەیری وانەکەی و جۆری وتنەوەی و گەیاندنی بە قوتابییەکان دەکات، چونکە چ قوتابی چ مامۆستا چەند شتێکی حەتمی دەزانن و لەو ڕوانگەیەوە بیر دەکەنەوە، کاتێک کە مامۆستا و قوتابی چەند شتێک بە حەتمی دەزانن ئیتر ئەمە دەبێت بە نەمانی پەیوەندی لەنێوانیاندا، بۆ ئەوەی پەیوەندی لەنێوان دوو کەسدا کاری خۆی بکات پێویستە هەردوولا هەمان شت بە حەتمی بزانن، بۆ نموونە : منداڵێک لە گۆڕەپانی قوتابخانەدا و لە کاتی پشوودا کەوتبوو و دەمی بریندار بوو بوو کاتێ کە پێیان وت بۆچی ناچێت بۆ ژووری مامۆستایان پێیان بڵێیت کە بریندار بوویت، وتی : کە مامۆستا وتویەتی لە کاتی پشوودا نابێت بێنە ژووری مامۆستایان. لە ڕاستیدا مامۆستا وتبووی کە لە کاتی پشوودا نابێت ڕاکەنە ژووری مامۆستایان، چونکە پشوویان هەیە. ئەمە شتێکی حەتمی بوو بۆ مامۆستاکە لەکاتی ئاساییدا، بەڵام ئەم دەستوورەی مامۆستا لەهەموو کاتێکدا نەبوو و لەکاتی پێویستدا دەتوانرا چاوپۆشی لەم دەستوورە بکرێت، بەڵام بەلای قوتابییەکەوە وا نەبووە، چونکە ئەو وای لێکدابووەوە کە ئەمە شتێکی حەتمیە و دەبێت ڕەچاو بکرێت.

نموونەیەکی تر: کاتێ کە منداڵ دەست دەکات بە چوونە قوتابخانە، مانای ئەوەیە کە هەر لە ئێستاوە مامۆستا چەند شتێکی لە مێشکدایە کە دەبێت منداڵی سەرەتایی و پۆلی یەک بیزانێ (حەتمی ) جا کاتێ کە ئەم شتە (حەتمی) یە لە منداڵێکدا نەبێت و ژیانی پێش قوتابخانە ئەم شتانەی بۆ بەدەست نەهێنابێت ئەوا پەیوەندی نێوانی مامۆستاو قوتابی خراپ دەبێت و بە هەڵە لە یەکتری دەگەن. جا کاتێ کە مامۆستا ئەمەی زانی و زانی کە مەرج نییە هەموو قوتابییەک ئەم حەتمیەتەیان تێدا بێت ئەوا هەوڵدەدات بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم حەتمیەتانە کە ڕوونکردنەوەیان دەبێت بەهۆی نەهێشتنی جیاوازی لەنێوان بیری مامۆستاو بیری قوتابیدا.

چۆن لە یەکتری دەگەین؟

چۆن قوتابییەک هەوڵدەدات لەوی تر بگات و چۆن لە مێشکی خۆیدا و لەسەر چ بناغەیەک وێنەیەک بۆ بەرامبەرەکەی دروست دەکات و چۆن لەسەر چ بناغیەک مامۆستایەک هەوڵدەدات کە لە قوتابییەکان بگات و چەند ئەم تێگەیشتنەی ڕاستە و چەند هەڵەیە و وانییە وەکو خاوەنەکەی لە ڕاستیدا وایە؟

پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ یەکتریدا هەر لە پێشەوە مەحکوم کراوە بە ژێر کەوتن ئەگەر خاوەنەکەی لە بیری خۆیدا و پێش ئەوەی بە تەواوەتی لە مرۆڤەکەی بەرامبەری گەیشتبێت وێنەیەکی کێشا بێت بۆی و ئاواتەخوازبێت کە بە پێی ئەو وێنەیە رەفتار بکات، ئەمە زۆرجار ڕەفتارمان لەگەڵ یەکتری دەگۆڕێ و کارێکی باش یان خراپ دەکاتە سەر پەیوەندیمان بەیەکەوە و لە ڕاستیشدا باسکردن و لێکۆڵینەوەی کارێکی وا زۆر ئاسان نییە و پێویستی بە کەسانێکی زۆر شارەزاو لێزان هەیە بۆ ڕوونکردنەوەی. بەڵام ئەوەی گرنگە لێرەدا پەیوەندی نێوانی مامۆستا و قوتابییە و پەیوەندی نێوانی قوتابییەکان لەگەڵ یەکتریدا.

بیری چاکی (سپیان) بەرامبەر (سۆران) کار دەکاتە سەر پەیوەندی نێوانیان و بەپێچەوانەشەوە هەروایە، ئەم بیرە چاکەی (سپیان) بەرامبەر (سۆران) کاردەکاتە سەر چاوەڕوانی (سپیان) بۆ شتی باش لە (سۆران)ەوە.

له پەیوەندی نێوانی دوو مرۆڤدا زۆرجار دەنگوباس و ناوبانگی مرۆڤەکان کار دەکەنە سەر چاوەڕوانیان ل یەکتری پێش ئەوەی یەکتری ببینن، بەڵام لە کاتی پەیوەندییەکەدا زیاتر بیری مرۆڤەکان لەسەر ئەو ڕووداوانە وەستاوە کە ڕوودەدات لە نێوانیاندا، بەچ شێوەیەک قسە دەکەن؟ چ وەڵامێک دەدرێتەوە؟ چۆن پێشنیارەکان وەردەگیرێ؟ چۆن ئەویتریان گوێ دەگرێ؟ چەند گوێکرێکی باشە؟ لەم کاتەدا مرۆڤەکە هەوڵدەدات لە کاتی قسەکردن لەگەڵ ئەویتردا هەڵسوکەوت و جۆری قسەکردن و ڕاددەی زانیاری و زیرەکی بزانێ. لەهەمانکاتدا ئەویتریشیان هەوڵدەدات کە لەویتر بگات و لە مێشکی خۆیدا وێنەیەکی بۆ بکێشێ.کاتێ کە مرۆڤ دەیەوێت بناغەیەک بۆ تێگەیشتنی بەرامبەرەکەی دانێ، مانای ئەوەیە کە هەوڵدەدات ئەو شتانەی کە (شاراوەن) لێی، ڕوونی بکاتەوە و تێی بگات بەهۆی زانینی هەست و بیرو خواستیەوە بە چاودێریکردنی ئەوەی دەیڵێت و دەیکات لە نیشانەی دەموچاودا، دەنگ و چۆنیەتی دانیشتن و جووڵاندنی دەست و .. ئەمە مانای ئەوەیە کە مرۆڤ لەم کارەیدا هەوڵدەدات تێبینی و تۆژینەوەو حوکمدان بەسەر کەسێکی تردا بدات بۆ ئەوەی بگاتە ئەوەی کە وێنەیەکی ڕاست لەبارەی ئەو کەسەوە بزانێ.

لەم کارەدا مرۆڤ پشت بە ڕووداوی پێشووتر دەبەستێت و بەراوردی ئەو کەسە لە کات و شوێنی جیاوازدا و لەگەڵ خەڵکی جیاوازدا دەکات، کە زۆرجار وا دەکات کە هەر پێشەکی مرۆڤ وێنەیەکی دروست کردووە بۆ ئەو کەسە لە مێشکی خۆیدا و دەبێت بەهۆی ئەوەی کە زۆر گران ئەو وێنەیە بگۆڕێ و بیری خۆی بگۆڕێ لەسەر ئەو کەسە کە لەوانەیە زۆرجار دەبێت بەهۆی ئەوەی کە توانای نەبێت چاودێری شتی گرنگی تازە بکات کە ڕوویداوە لە مرۆڤەکەدا.

کەواتە ئەمە کارێکی زۆر ئاڵۆزە و ڕێی تێ دەچێت بۆ بە هەڵەدا چوون، زۆرجار قوتابی بە هەڵە لە هاوڕێکەی دەگات و مامۆستا بە هەڵە لە قوتابییەکانی دەگات، لەبەرئەوە پێویستە (زۆر ئاگاداربین و واکردەوە نەکەین کە ئێمە بە تەواوەتی لەوەی بەرامبەرمان گەیشتووین) بۆ یارمەتی تێگەیشتنی ئەم کارە زەحمەتە دەتوانین سوود لەم نەخشەیە وەربگرین:

خۆم دەیزانم　　　　خۆم نایزانم

1　　　　2

خۆم و خەڵکی　　　　خۆم نایزانم

دەیزانین　　　　خەڵکی دەیزانێ　　　　خەڵکی دەیزانێ

3　　　　4

خەڵکی نایزانێ　　　　خەڵکی نایزانآ　　　　خۆم نایزانم

خەڵکی نایزانێ　خۆم دەیزانم

ئەم وێنەیە پێشانی دەدات کە ناوچەیەک هەیە کە زانراوە لەلایەن خۆم و لەلایەن خەڵکی تریشەوە (1) یەکێکی تر داخراوە بۆ خۆم و نایزانم بەڵام بۆ خەڵکی کراوەتەوەو خەڵکی دەیزانن (2) شوێنی سێیەم خەڵکی نایزانێ و خۆم دەیزانم (3) شوێنێک کە نە خۆم دەیزانم نە خەڵکی (4).

لەکاتی پەیوەندی لەگەڵ خەڵکیدا و لەسەرەتای پەیوەندییەکەدا ئەم ناوچە جیاوازانە لە پەیوەندییەکە وای لێدێ.

1　　　　2

3　　　　4

لە دوای ئەوەی کە ناسینێکی باش لەنێوانی دوو کەسدا دروستبوو، ئیتر وێنەکە دەگۆڕێ و وای لێدێ.

1　　　　2

3　　　　4

پشکنین دەریخستووە کە پلەی کۆمەڵایەتی و ئابووری قوتابی کار ناکاتە سەر پێوانی شوێنی کۆمەڵایەتی قوتابی بۆ هاورێکانی.

له پشکنێنێکدا لەسەر قوتابیانی سەرەتایی پۆلی 7 و 8 (Stensasson 1970) و 9 لە نەوریج بۆی دەرکەوتووە کە قوتابییەکان وا بیر ئەکەنەوە کە ئەگەر قوتابییەک یەکێکی خۆش ویست ئەوە وا ئەزانێ کە ئەویش ئەمی خۆش ئەوێت. بۆ نموونە (A) لەگەڵ (B) کە پێی خۆشە لەگەڵ ئەم بێت، هەر ش حەز ئەکات لەگەڵ ئەم بێت، هەمان بیر لەناو قوتابیاندا هەبوو کە ئەو قوتابییەی وای ئەزانی کە ئەو قوتابییەی ئەم نایەوێت لەگەڵیدا بێت ئەویش نایەوێت لەگەڵ ئەم بێت.

ئێستا ئەگەر پرسیار لە خۆمن بکەین، کە ئایا هەست و نەستمان بەرامبەر بە خەڵکی پێش ئەوەیە کە بزانین چۆنن؟ پشکنین دەریخستووە کە پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ یەکدا دەست پێ ئەکات بە هەستی خۆت لە پێشدا نەک بەوەی کە بزانی ئەوی تر چۆن هەست ئەکات.

چۆن قوتابی لە مامۆستا ئەگات

بۆ ئەوەی مامۆستا زیاتر لە قوتابییەکان بگات و زانستی تەواو و ڕاست کۆبکاتەوە بۆ ئەوەی بتوانێ حکمی ڕاست و دادپەروەرانە بدات لە بڕیارەکانیدا و بتوانێ بارێکی ئاسایی و باش و لەبار دروست بکات لەناو قوتابییەکاندا و لە بەینی خۆی و قوتابییاندا و بۆ ئەوەی بتوانێ یارمەتی ئەو قوتابیانە بدات کە پێویستیان زیاتر بە یارمەتی هەیە و لە بارو دۆخێکی خراپدا ئەژین لەناو هاوڕێ قوتابییەکانیاندا .

لێرەدا باسی هەندێ ڕێگای زانراو ئەکەین بۆ تێگەیشتن لە قوتابیان .

1- سۆسیۆمتری

شێوەیەکی ئاسانی سۆسیۆمتری ئەوەیە کە پرسیار لە قوتابییەکان بکرێت کە (ئایا ئەتەوێت لەگەڵ کێ هاورێ بێت؟) قوتابییەکان ناوی ئەو کەسانە ئەنووسن کە ئەیانەوێت هاورێ بن لەگەڵیاندا ئیتر ئەمە جاری وا هەیە یەک کە هەڵبژاردن ڕێگا ئەدرێت یاخود لە مابەینی 3 -5 هەڵبژاردندا و قوتابییەکان وەڵامەکەی

ئەدەنەوە بە مامۆستا بەبێ ئەوەی ناوی خۆیان لەسەر کاغەزەکە بنووسن و بۆشیان نەبێت کە ناوی خۆیان بنووسن لە تەنیشتن پرسیارەکەوە.

ئەمە ئەکرێت هەر لە پۆلی دوو و سێ وە و بەرەو ژوور بە مانای هەر کاتێ قوتابییەکان توانیان ناوی یەکتری بنووسن ئەتوانرێ ئەم تاقیکردنەوەیە بکرێت. هەروەها مامۆستا پێویستە پەیمانی ئەوەیان بداتێ کە وەڵامەکانیان نهێنییە و کەس لە سەرەنجامی تاقیکردنەوەکە نازانێ و کەسی تر لە مامۆستا زیاتر بەکاری ناهێنێ.

دوای ئەوەی مامۆستا وەڵامەکانی وەرگرتەوە،وەلامەکان لەسەرنەخشەی سۆسیۆگرام ئەکیشێت و ئەتوانیت بەتەواوەتی لەپەیوەندی بەینی قوتابیەکانی بۆدەرکەویتلەگەل زۆر زانستی تر کە ئەتوانیت بەکاریبهنیت بۆبۆیارمەتی ئەوقوتابیانەی کە زیاتر پیویستیان بە یارمەتی هەیە، هەروەها سودیلیوەرگریت لەکاتی دابەشکردنی پۆلەکەدا بۆ کۆمەلی جیاواز جیاوازکە ئەندامەکانی بگونجین لەگەلئەکتریدا، شیوەی شۆسێۆگرامەگە ئاوایە:


1- Grupp processer. Sven Stensaasen & Olav Sletta
2- Fem år av ditt liv. Barnens utveckling under åldersperioden 7-12 år. Barbro Goldinger & Gunilla Magnusson
3- Spelar läraren någon roll? Stellan Sjödén..
4- Ditt Lilla Barn och Du. Anneta Tholstrup.
5- Föräldrars kunskap - De lycklige åren. Ottar Ottersen.
6- Möt mig. Solveig Grönström Beskow.
7- Barn och Föräldrar i Samspel. Marie Eenfeldet.
8- Att förstå barns tanker. Elisabet Doberborg & Ingrid Pramling.
9- Sköt om ditt barn. Benjamin Spock.
10-Sago Skolan. Rigmor Lindö.
11-0-17 Fakta om barn och ungdomar i Sverige.
12-Att samtala med barn. Joan Tongh.
13-Ungar är olika. Agneta Hellström.
14-Våra Barn. David Fontana.